زنجیرەی / باچاکتر ئیسلام بناسین ٢
ئاڵقەی دووەم



# پێغەمبەران

عَلَيْهِمُ الصَّلوٰةُ والسَّلام

نووسینی
علی باپیر

چاپی دووەم

١٤١١ك - ١٩٩٠ ز

# پێشکەشە

بەو زانا خواناسی و پارێزکارو فیداکارانەی کە میراتگری ڕەسەن و جێگری ڕاستەقینەی پێغەمبەرانن و ، ئەرکی بەرزو پیرۆزی میراتگری و جێگرایەتی ئەو زاتە مەزنە بەرزانە (علیهم الصلاة والسلام) بەپاکی بەجێ دێنن و خەڵکی لە گێژی نەفامی و ژێر نیری طاغووتا دەردێنن و بەرەو ڕووناکی خواپەرستی و سێبەری دادگەرییان دێنن ، نەک بازرگانی و سەودا بە بەرنامەی خواوە بکەن و ئایەتەکانی خوا بە نرخێکی کەم بفرۆشن و ، دینی خۆیان بە دنیای خەڵکی بدەن .








الحمد لله رب العالمين وصلاته وسلامه على جميع الأنبياء والمرسلين
وعلى سادة الأمين والنبيين ، وأئمة المصلحين وقادة المجاهدين وآلهم وأصحابهم وأتباعهم الجيدين .

مسوڵمانی بەڕێزو خۆشەویست !

دووەمین وشەو زاراوەی بنەڕەتی کە دەمانەوێ لـــەم زنجیرەیەدا بیتوێژینەوە ، بە مەبەستی زیاترو چاکتـــر ناسینی ئیسلام و خستنەرووی بنچینەو هێڵە گشتی و سەرەکـــی یەکانی بریتیە لە وشەی ( پێغەمبەران ) علیهم الصلاة والسلام .

چونکە ( پێغەمبەرانی خوا ) خوای بەرزو مەزن پلـــەو پایەیان بەرزتر بکاتەوەو لەخۆییان نیزیکتر بخاتـــەوەو ، زیاتر لە دەریای بێ سنووری لوتف و بەزەیی و بەخششی خوای بەشیان بدات ، کە هەڵبژاردەی مرۆڤایەتی و سەرتۆپــــی کاشیناتن ، ئێستا زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی مسوڵمانیـــش چ جای نامسوڵمان ، بیروبۆچوون و تێروانینی سەیروسەمەرەو ناقۆڵایان دەربارەیان هەیە ، کە لەگەڵ کەسایەتی(شخصیة) و واقیعی ئەو ئینسانە کامڵ و بەرزو بێ وێنانەدا نێوانیان ئاسمان و ڕێسمانە .

بەڵام ڕەنگە ئەو خەڵکەش زۆر جێی گلەیی و گازندە نەبێ، چونکە لەسۆنگەی ئەوەوە کە چەندان جار لە گەلێک بابـای زاناو خۆبەزانا زانی نەزانی بە نەزانیی خۆنەزانیـــان

بیستوه كه پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی:
( إن العلماء ورثة الأنبیاء .. ) رواه أحمد وأصحاب السنن،
واته : بێگومان زانایان میراتگری پێغەمبەرانن ، جا ئەو
خەڵكه هاتوون لەبەرتیشكی ئەم فەرموودەیەدا تەماشـــای
پێشەوایانی ئێستای ئاییینیان كردوەو ، پاشانیش واقیع و
چۆنیەتی رەفتارو كەسایەتی ئەو ( پێشەوا ) یانەیان كردۆته
روانگەی لێوه سەیركردنی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلامو
تەرازووی هەڵسەنگاندنیان ، چونكه عەقڵ و مەنتیق دەڵێن :
( پێویسته جێدار " مُوَكِّلْ " چۆن بێت ، جێگر " وكیل " یش
وابێت ) و دیاره میراتگر " وارث " یش هەر ئەوه بــه
میرات دەگرێ كه میراتدار " مُورِّث " بەجێی دێڵێ !!
ئنجا لەبەرئەوەی زۆربەی[1] هەرەزۆری ئەوانەش كه ئێستا
له واقیعی بەرچاوی خەڵكی دا لەسەر میراتگری و جێگرایەتی
پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام حیساب دەكرێن و به زانا و
پێشەوا و چاوساغ لەقەڵەم دەدرێن ، یان سادەو بێ ئاگــاو
كەم هۆشن ، یان هەلپەرست ( إنتهازي ) و پەیمان شكێــن و
دین فرۆشن ، خەڵكی سادەو عەوام و بێ هــــەواڵ ، وەك
ئەنجامێكی سروشتی و ژیربێژی ( منطقي ) یانه قیاســـی
پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام لەو میراتگرو جێگـــره
روالەتی یانه دەگەن و ، سەرەنجام خراپ حاڵی دەبــن و

---

(١) بەڵێ خوێنەری بەڕێز بەپێی گفت و بەڵێنی پێغەمبەرمان علیه الصلاة والسلام لە هەموو چاخ و سەردەمێكدا كۆمەڵێكی راست و ساغ لە ئوممەتی ئیسلام ـ لە پێشەوایان و غەیـــری ئەوانیش ـ هەر لەسەر خەت و رێبازی رەسەنی ئیسـلام دەمێننەوە ، بەڵام بێگومان بەرگ و كاڵاو شێوەو مەسلەكێكی تایبەتی یان تێدا لەبەرچاو نەگیراوە .

بەهەڵەدا دەچن و ، مەگەر هەر خوا بە لوتفی خۆی بیانپارێزێ و دڵی سادەو بێ غەرەزو سروشتی خواپرسک ( فطري ) یانەی خۆیان چەپاڵەیان بدات ، دەنا حەتمەن ( ئایین ) و ( پێغەمبەران ) یان لەبەرچاو دەبێزرێ و، هەتلەو لارێ دەبن و بەمەرەدی ئەو کەسە دەچن کە پێشینان گوتەنی :( زاری بە " شیر " ی سووتابوو ، فووی لە " دۆ " ش دەکرد ! ) .

جا مسوڵمانی بەڕێز !

ئێمە خوا پشتیوان بێ لەم ئاڵقەیەدا بە ئەندازەی مەودانی سنووری ئەم زنجیرەیە ، وشەی بەرزی ( پێغەمبەران ) روون دەکەینەوەو ، ئەو زاتە مەزن و بێ وێنانەت پێ دەناسێنین .

لە خوای بێ هاوتاش داواکارم بمانگێڕێ بە شوێن کەوتووی راست و ساغی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام .

١٧ ذوالقعدة ١٤١٠ ک

خدراوا

# ڕێ خۆش کردن

خوێنەری بەڕێز !

ئەم نووسراوەی بەردەستت کە بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی وشەی بەرزی ( پێغەمبەران ) علیهم الصلاة والسلام و پێناسەیەکی کورتی ئەو زاتە بەرزو پەسندو بێ وێنانە نووسراوە بەم شێوەیە :

لەپێشەوە لە (١٠) خاڵان دا (١٠) باسی گرنگ دەربارەی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام دەنووسین کە ئەمانەن :

١ـ پێغەمبەرایەتی چی یە ؟!
٢ـ پێغەمبەران کێن ؟!
٣ـ حیکمەتی ( ئینسان بوون ) ی پێغەمبەران چی یە ؟!
٤ـ پێغەمبەران بۆچی نێرراون ؟!
٥ـ خەسڵەتە پێویستەکانی پێغەمبەران چین ؟!
٦ـ تایبەتمەندی یەکانی بانگەوازی پێغەمبەران کامانەن ؟!
٧ـ بۆچی پێغەمبەران خاوەنی موعجیزەن ؟!
٨ـ ئایا لەنێوان پێغەمبەران دا بەرزی و نزمی هەیە ؟!
٩ـ ژمارەو جۆری پێغەمبەران .
١٠ـ بانگەوازی پێغەمبەران لە ئەسڵ دا یەکەو شێوەکانی جیاجیان .

پاشان باسێک بەناوی ( ئەنجام و بەرهەمی ئەم جۆرە بڕوا بە پێغەمبەران بوونە ) لە (٥) خاڵان دا دەنووسین ، کە هەروا بەکورتی و گوشراوی یەرێزو شوێنەوارو بەرهەمی ( پێغەمبەر ناسین ) لە ژیانی مرۆڤی مسوڵماندا دەخەینەڕوو .

ئنجا لێرەدا دەق و ( متن ) ی ئەم ئاڵقەی دووەمەش تەواو دەبێت ، بەڵام لە دووتوێ ی ( پاشکۆ ) یەکدا ـ بە پشتیوانی خوا ـ ئەم چوار بابەتانەش دەتوێژینەوە :

١ـ هەقی پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام بەسەر شوێنکەوتووانی یەوە .

٢ـ بەسەرهاتێکی پڕ مەعنا ، کە لەبابەت درووشم و نیشانەکانی پێغەمبەرمانەوەیە صلی اللە علیە وسلم .

٣ـ ململانێی هەق و ناهەق ، کە وتوویژێکە لەنێوان پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام و سەرانی کوفردا .

٤ـ بەرکوڵێک دەربارەی یادی لەدایک بوونی پێغەمبەری پێشەوا صلی اللە علیە وآلە وسلم .

ئیدی ئەتۆو باسە جۆراوجۆرەکانی ئەم کتێبە .

# ١

# پێغەمبەرایەتی (النبوة) چی یە؟!

لەبەرئەوەی پێغەمبەران صەلات و سەلامی خوایان لەسەربێ کەسانێکن کە لەلایەن خواوە ( وەحي ) یان بۆ دێ و ، هەواڵ ( نَبَأ ) یان پێ ڕادەگەیەنرێ و هەندێکیشیان تەکلیفیان لێ دەکرێ کە بانگەواز ( دعوة ) و پەیام ( رسالة ) ی خوداش بە خەڵکی ڕابگەیەنن ، ئەگەر بمانەوێ وەک پێویست لە مەعنا و مەبەستی وشەی پێغەمبەرایەتی ( النبوة ) تێ بگەین و ، پەی بە وەڵامی پرسیاری سەرێ ببەین ، پێویستە سەرەتا لە چەمک و واتای زمانەوانی ( لغوي ) و زاراوەیی ( إصطلاحي ) هەرکام لەم سێ وشەیە بگەین :

١- ( الوحي ) ٢- ( النبيّ ) ٣- ( الرسول ) .

یەکەم : وشەی ( الوحي ) لە ئەسڵی زمانی عارەبی دا وەک، توێژەرەوانی زمان دەڵێن : بە قسەیەکی (١) پەنهان و شێرراوە ، یان (٢) بە ئامازەیەکی خێرا دەگوترێ ، لە زاراوی شەرعیش دا (٣) وەحی بەو پێ ڕاگەیاندن ( تبليغ )ە پەنهان و خێرایە دەگوترێ کە خوا بە یەکێک لە ڕێگایەکانی پێ ڕاگەیاندن بە چەند بەندەیەکی تایبەتی و

---

(١) ئەمە ڕای ( زمخشري ) یە لە کتێبی ( أساس البلاغة ) دا ، بڕوانە ( الوحي المحمدي) محمد رشيد رضا /ترجمة فارسی ص ١٩.
(٢) ئەمەش ڕای (راغب الاصفهاني ) یە ، سەرچاوەو لاپەڕەی پێشوو.
(٣) سەرچاوەی پێشوو ص ٢٠ .

دانستەو هەڵبژاردەی خۆی دەگەیەنێ کە پێغەمبەرانــــی پایەبەرزن علیهم الصلاة والسلام .

دووەم : وشەی ( النبوة ) [1] لە ڕیشەی ( نَبَأ ) وەرگیراوە کە بە مەعنای هــەواڵ ( خَبَرْ ) دێت ، یان لە ڕیشــەی ( نَبْوَة ) وەرگیراوە کە بە شوێنێک دەگوترێ کە لە ئاستی زەوی بەرزتر بووبێتەوە .( نبأ الشيء أيْ إرتَفَعَ ) .

لە زاراوی شەرعیش دا بریتیە لەوە کە خوا یەکێک لــە بەندەکانی هەڵبژێرێ بەهۆی وەحی بۆناردنەوە ، هەڵبەتـــە مەعنا شەرعی یەکەش پەیوەندی یەکی پتەوی بە هـــەردووک مەعنا زمانەوانی یەکانی یەوە هەیە کە بریتین لە هەواڵ و بەرزبوونەوە ( الخبر والأرتفاع ) ، واتە :( النبـــيّ ) بەندەیەکە خوا هەڵی بژاردوە کە وەحی بۆ بنێرێ ، ڕێژگــە ( صیغة ) ی ( فعیل ) یش ، هەم بە مەعنای ( إسم الفاعل) دێ و هەم ( إسم المفعول ) یش جا ئەگەر ( نبيّ ) بــە مەعنای ( إسم الفاعل ) بێ ، ئەوە بە کەسێک دەگوترێ کە هەواڵدەر ( مُخْبِر ) بێ بەو شتە پەنهانانەی کە لە ڕێگای وەحی یەوە پێی ڕادەگەیەنرێن ، یان بە کەسێک دەگوترێ کە لە غەیری خۆی بەرزتر ( مُرتفِع ) ترە بەهۆی هەڵبــژاردن و وەحی بۆناردنی خواوە .

بەڵام ئەگەر ( نبيّ ) بە مەعنای ( إسم المفعول ) بــێ ، ئەوە بابایەکی هەواڵ پێدراوە ( مُنَبَّأ ) ە لە ڕێ یەکــی پەنهانەوە ، یاخود بەسەر غەیری خۆی دا بەرز ( مرفــوع ) بۆتەوە بەهۆی هەڵبژاردن و وەحی بۆناردنی خواوە .

---

(1) بڕوانە ( العقيدة الأسلامية وأسسها ) عبدالرحمن حسن حبنكة الميداني / ص ٢٩٧ ، ٢٩٨ .

سێ یەم : وشەی ( الرسول ) [1] لە ئەسڵی زمان دا بە کەسێک دەگوترێ کە پەیام ( رسالة ) یێکی پێ دراوەو ، هەواڵــــی گەیاندنی دەدات .

لە زاراوی شەرعیش دا ( رسول ) [2] ئەو هەواڵ پێدراو ( نبیّ ) ەیە کە لەلایەن خواوە داوای لێ کراوە بەرنامــەی خوا بە خەڵکی ڕابگەیەنێ .

دیارە ( رسالة ) ش ئەو پەیام و بەرنامە خوایی یەیە کە بۆ یەکێک یان زیاتر لە پێغەمبەرانی خۆی ناردوە، کە بە خەڵکی ڕابگەیەنن .

ئەمەش چەند دەقێکی قورئان وەک نموونە بۆ بەکارهێنانی هەرکام لەم سێ وشانە ( الوحي ، النبيّ ، الرسول ) :

١- ( وما كان لبشر أن يكلمه الله إلاّ وحيا أو مِنْ وراء حجاب أو يرسل رسولا فيوحي بأذنه مايشاء إنهُ عليّ حكيم ) . الشورى / ٤٢ .

٢- ( إذ يوحي ربك إلى الملائكة إني معكم ... ) الأنفال / ٨

٣- ( وإنّ الشياطين لَيُوحون إلى أولياءِهم .. ) الأنعام / ١٢١ .

٤- ( يا أيها النبي إنّا أرسلناك شاهدا ومبشرا ونذيرا .. ). الأحزاب / ٤٥.

٥- ( وكأيِّن مِنْ نبيٍّ قاتلَ معه رِبّيّونَ كثير .. ) آل عمران / ١٤٦

٦- ( يا أيها الرسول بَلّغْ ما أُنزِلَ إليك مِنْ رَبّك .. ) المائدة / ٦٧ .

---

(١) بروانە ( العقيدة الأسلامية وأسسها ) عبدالرحمن حسن حبنكة الميداني / ص ٢٩٧ ، ٢٩٨ .

(٢) لە زمانی کوردی دا بەس وشەی ( پێغەمبەر ) یـــان ( پەیامبەر ) مان هەیە بۆ هەرکام لە وشەی ( نبیورسول)یش بەڵام بێگومان وشەی ( پەیامبەر ) تەنیا واتای وشــەی ( رسول ) دەگەیەنێ ، چونکە ( رسول ) بابایەکی خاوەنــی پەیام و بەرنامەیەکی خوایی یە ، یان ڕاگەیاندنی پەیام و بەرنامەیەکی خوایی بەئەستۆوەیە .

٧- ( أللە يصطفي مِنَ الملائكةِ رُسلاً ومِنَ النّاس .. ) الحج /٧٥.

کەواتە :

پوختەی قسان ئەوەیە کە پێغەمبەرایەتی ( النبوة ) بریتییە لەو ئەرک ( وظیفة ) ەی کە خوای میهرەبان و کاربەجێ بەپێی ویست و زانیاری تێروتەواوی خۆی و بە مەبەستی هیدایەتدان و خواناسین و کامڵ بوونی بەندەکانی بە یەکێک لە بەندە شایستەو هەڵبژاردەکانی خۆی دەسپێرێ لە ڕێگای وەحی یەوە ، جا ئەگەر ئەرکی ناوبراو ڕاگەیاندنی پەیام و بەرنامە ( تبليغ الرسالة ) ی لەگەڵ بێت ئەوە ئەو بەندە هەڵبژاردەیە هەم ( نبيّ ) یەو هەم ( رسول)یشە ، ئەگەر نا ، تەنیا ( نبيّ ) یە ، کەواتە ( نبيّ ) بابایەکە خوا لە ڕێگای وەحی یەوە لە ڕێ پێشان دان و هیدایەتێکی تایبەتی بەهرەمەندی کردوەو ، بەس خۆیشی لەسەرە ، بەڵام ( رسول ) وێڕای خۆی خەمی خەڵکیشی لەبەرەو ، وێڕای خۆچاککردن ئەرکی هەوڵدان بۆ تێگەیاندن و پێگەیاندنی خەڵکیشی لەسەرە ، ئنجا پێویستە ئەوەش بگوترێ کە پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی بەهەردووک شێوەکانی‌یەوە ، لوتف و بەخششێکی خوایی‌یەو بەهۆی هەڵبژاردنی پەروەردگاری زانا و کاربەجێ وە دێتەدی و ، هیچ جۆرە پەیوەندی یەکی کەم و زۆری بە هەوڵ و تێکۆشان و باس و لێکۆڵینەوەو بەدوادا گەڕانەوە نییە ، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی هەروا بە گۆترەکاری و بێ حیکمەت و هۆ

دەبەخشرێ ، نەخێر چونکە خوا خاوەنی هەموو سیفەتێکــــی بەرزو پەسندەو ، یەکێک لەو سیفەتانەش کاربەجێ یی یە ، خوای کاربەجێ و زاناش لەوبارەوە فەرموویەتی :

( أللە أعلم حيثُ يَجْعَلُ رِسالَتَهُ ... ) الأنعام / ١٢٤ .

واتە :

خوا لە هەموو کەس چاکتر دەزانێ بەرنامەکەی بە کێ دەسپێرێ ...

# ٢

# پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام کێن ؟!

خوای بەرزو مەزن و کاربەجێ لە قورئانێ دا لەسەر زمانی ( مووسا ) علیه السلام لە وەڵامی فیرعەون دا کە پرسیویەتی :( فَمَنْ رَبُّكُما يا موسى ؟ ) طه/٤٩. ئەدی گەورەو سەروەری ئێوە کێ یە ئەی مووسا ؟! فەرموویەتی :( رَبُّنا الذي أعطىٰ كلَّ شيءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدىٰ ) طه/٥٠ . واتە : گەورەو سەروەرمان ئەو زاتەیە کە بوونی بە هەموو شتێک بەخشیوەو ڕێڕوونییشی کردوە !

( موسی ) علیه الصلاة والسلام بەم وەڵامەی ویستوویەتی دوو ڕاستی ( حقیقة ) ی زۆر گەورە لە فیرعەون حاڵی بکات ، یەکەم : حاڵەتی یاساداری ( مُنَظَّم ) ی بوونەوەرو بەڕێوەچوونی بەپێی نەخشەو بەرنامەیەکی زانیاری یانەی ڕێک و پێک بەڵگەیە لەسەر بوونی خوایەکی پەروەردگارو زاناو دەسەڵاتدارو میهرەبان ، کەواتە گەورەو مشوورخۆری ئێمە ئەو خودا پەروەردگارەیە کە تێکڕای بوونەوەری خوڵقاندوەو بەسەریشی ڕادەگات ! دووەم : هەر هەمان خوای پەروەردگار کە بوونی بە هەموو شتێک بەخشیوەو لەسەر بنچینەی بەرنامەو پەیڕەوێکی ڕێک و پێکیش ڕێڕوونی کردوە ، هەر ئەویش بوونی بە ئێمە ـ ی ئینسان ـ بەخشیوەو هەر بۆخۆشی مشوورمان لێ دەخوات و بەرنامەی ژیان و گوزەرانمان بۆ دیاری دەکات .

بەڵێ خوێنەری خۆشەویست !

خوای بەدیهێنەرو پەروەردگار پۆشاکی بوونی بە هەرشتێک پۆشی بێ ، ڕێگاو بەرنامەی بەڕێوەچوون و کامڵ بوونیشی بۆ داناوە ، جا هەندێک جاران ئەو ڕێگاو بەرنامەیە لە چەند یاساو دەستوورێکی فیزیایی و کیمیایی دا خۆی دەنوێنێ و ، هەندێک جاران لە چەند غەریزەیەک دا ، بەڵام ئینسان لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئەرکی تاقیکرانەوەو جێ نشینایەتی ( الخلافة ) ی لەسەر زەوی پێ سپێرراوە ، لە بواری جموجۆڵو چالاکی یەکانی دا تا ڕاددەیەکی زۆر ئازادیی پێ دراوەو ، بۆ هیچ کام لە یاسا فیزیایی و کیمیایی و بیۆلۆجی یەکانو غەریزەو داخوازی یە مەعنەوی و جەستەیی یەکان گەردنی پێ کەچ نەکراوە ، ئنجا لەلایەکی دیکەشەوە لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئەرکێکی یەکجار گرنگ و مەترسی داری پێ سپێرراوە ، کە بەختیاریی یان ژینتاڵی هەمیشەیی پێوە بەندە ، خوای کارزان و میهرەبان وێڕای عەقڵ و دڵ و خەیاڵ و پێنج هەستەکان ، بە چەند ئینسانێکی شایستەو هەڵبژاردەدا بەرنامەو پەیڕەوی تایبەتیی خۆیشی بۆ ڕەوان کردوەو لە هەموو جۆرو شێوەکانی هیدایەت و ڕێ پێشاندان بەهرەمەندی کردوە .

کەواتە :

پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام ئەو ئینسانە نێرونەواوو شایستەو هەڵبژاردانەن کە خوای زاناو شارەزا بۆ گەیاندنی بەرنامەی تایبەتی خۆی - بە بەندەکانی - پەسندی کردوون ، خوای میهرەبان لەوبارەوە فەرموویەتی :( اللّه یصطفي مِنَ الملائکةِ رُسُلاً ومِنَ النّاس ... ) الحج / ٧٥ . واتە :

خودا چەند پەیامبەرێک هەڵدەبژێرێ لە فریشتان و لە خەڵکی ...

دیسان خوای زانا هەر لەبارەی ناساندنی کەسایەتی پێغەمبەرانەوە علیهم الصلاة والسلام فەرموویەتی :( وما أرسلنا مِنْ قَبْلِكَ إلاّ رِجالاً نوحي إليهم مِنْ أهل القرى ... ) یوسف / ١٠٩ . واتە :

وە لەپێش تۆدا هیچ کەسێکمان ڕەوان نەکردوە - بە سیفەتی پێغەمبەرایەتی - بێجگە لە پیاوانێک کە وەحیمان بۆ ناردوون لە خەڵکی ئاوەدانی یەکان ...

کەواتە لەم ئایەتەو لە ئایەتی پێشوویەوە سێ خەسڵەت و نیشانەی بنەڕەتی پێغەمبەرانمان بۆ دەردەکەوێ :

یەکەم : پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام هەرکامێکیان تەواوترین و شایستەترین خەڵکی سەردەمی خۆیەتی و ، هەموشیان هەڵبژاردەو سەرتۆپی مرۆڤایەتین و ، هیچ کەس نەک هەر لەوان چاکتر نیە ، بەڵکو تۆزی ڕێیەشیان ناشکێنێ .

دووەم : پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام هەموویان پیاو بوو ون و ، ئەو پایە بەرزو ئەرکە قورس و پڕ مەترسی یە بە ئافرەتان ڕەوا نەبینراوە ، خواش بۆخۆی چاکتر تواناو وزەی بەندەکانی دەزانێ و ، باشتر ماهیەتیان دەناسێ ، ( ألا يعلمُ مَنْ خَلَق وهو اللطيف الخبير ؟ ) المُلك / ١٤ .

سێیەم : پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام هەموویان خەڵکی شارو ئاوەدانی یەکان بوو ون و ، هیچ کامیان ڕەوەندو کۆچەری نەبوو ون ، ڕەنگە هۆو حیکمەتی ئەمەش ئەوەبێ، کە

خەڵكی نیشتەجێ ( الحَضَرْ ) لە خەڵكی دەشتەكی ( أهل البادیة ) ژیرو وریاو چاوكراوەترو لێزانترن ، دیارە پێغەمبەرانیش كە هەڵبژاردەی مرۆڤایەتین ، پێویستە لە هەموو ڕوویێكەوە ـ تەنانەت لە شوێنی تێدا گەورەبوون و پێگەیشتنیش دا ـ تێروتەواو بن ، بۆئەوەی بتوانن بە چاكترین شێوە ئەركی سەرشانیان بەجێ بێنن و ، پەیام و بەرنامەی خوا ڕابگەیەنن .

## ٣
# حیكمەتی ئینسان بوونی پێغەمبەران چی یە؟!

هەر لە سەرەتای مێژووەوە ناحەزو نەیارانی خەت و رێبازی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام، ( ئینسان بوون ) ی پێغەمبەرانیان كردۆتە بروبەهانەی بڕوا پێ نەهێنانیان و ، چاوپێچكی چاوی خەڵكی عەوام و سادە ، بۆ وێنە : خوای زانا دەربارەی ( نووح ) و گەلەكەی فەرموویەتی :( ولقد أُرسلنا نوحا إلى قومه فقال يا قوم اعبدوا الله مالَكُم مِنْ إلهٍ غيره أفلا تتقون ؟ فقال الملأُ الذين كفروا مِنْ قومه ما هذا إلاّ بشر مثلكم يريد أنْ يتفضل عليكم ولو شاء الله لأنزل ملائكة .. ) المؤمنون/٢٣،٢٤ واتە :

وە بێگومان نووحمان بۆ لای گەلەكەی ڕەوانە كرد ، فەرمووی : ئەی گەلەكەم خوا بپەرستن ! جگە لەوی هیچ خواتان نین ، ئایا خۆتانناپارێزن ؟! ئەو زلە زلانەی كە بێ بڕوا بوون لە گەلەكەی گوتیان : ـ ئەی خەڵكینە ! ـ ئەم كابرایە بەس ئینسانێكی وەك خۆتانە ، دەیەوێ خۆتان بەسەردا هەڵكێشێ ، وە ئەگەر خوا ویستبای ـ پێغەمبەرمان بۆ بنێرێ ـ فریشتەیەكی دەناردەخوار ..

هەروەها خوای قسەلەجێ لەبارەی هەڵوێستی بتپەرستانی مەككەوە لەبەرانبەر پێغەمبەرمان دا صلى الله عليه وآله وسلم فەرموویەتی :( وقالوا ما لِهذا الرسول يأكل الطعام

ويمشي في الأسواق .. ) الفرقان / ٧ . واته :
وه گوتيان : ئه‌مه چ پێغه‌مبه‌رێكه كه خواردنێ ده‌خوات و
به بازاڕان دا ده‌گه‌ڕێ – به مه‌به‌ستی كاسبی و بژیو په‌یدا
كردن – !!

هه‌ڵبه‌ته شتێكی یه‌كجار سروشتی و چاوه‌ڕوان كراوه كه
كه‌سانێكی خوانه‌ناس و بت په‌رست ، یان ماددی و دنیا ویست
عه‌قڵی به په‌رده‌ی هه‌واو ئاره‌زوو داپۆشراویان و ، دڵ و
ده‌روونی به خراپه‌و تاوان ژه‌نگ هێناویان قه‌ناعه‌ت به‌وه
نه‌كات ، كه ( ئینسان ) لێی بوه‌شێته‌وه ببێته دوێنراو
( مُخاطَب ) ی خواو هه‌ڵگری بانگه‌وازو په‌یام و به‌رنامه‌كه‌ی،
چونكه ئه‌وان به‌هۆی له‌خوا دووركه‌وتنه‌وه‌و شوێن كه‌وتنی
نه‌فس و ئاره‌زووه‌كانی یه‌وه‌و كه‌وتنه ته‌ڵه‌و داوی شه‌یتانه‌وه ،
خۆیان له مرۆڤ شۆڕاندوه‌و سنوورو له‌مپه‌ری نێوان خۆیان و
شه‌یتان و ئاژه‌ڵانیان شكاندوه‌و په‌ڕاندوه‌و ، ئنجا به حوكمی
یاسای ( هه‌ركه‌سه له هه‌مبانه‌ی خۆی دا گوێزان ده‌ژمێرێ )
له‌روانگه‌ی كه‌سایه‌تی نزم و په‌ستی خۆیانه‌وه ، ته‌ماشای
پێغه‌مبه‌رانی پایه‌به‌رزیشیان كردوه !!

به‌ڵێ گومانی تێدا نیه بابه‌یه‌ك بڕواو قه‌ناعه‌تی وابێ
كه ئه‌نجام و به‌رهه‌می گۆڕان و په‌ره‌سه‌ندنی مادده‌یه‌و ،
وه‌چه‌ی قه‌وزه‌و قرژاڵ و كرمه‌گڵخۆركه‌یه‌و ، به‌رازئاساو
مه‌یموون و سه‌گسار زاده‌یه ، ئاشكرایه كه له‌سۆنگه‌ی خۆڵه‌لا
سووك بوونه‌وه ئینسانی هێنده له‌لا گچكه ده‌بێته‌وه ، كه
قه‌ت قه‌ت ڕێ ی ناكه‌وێ له‌گه‌ڵ خوادا بدوێ و ، په‌یام و
به‌رنامه‌ی لێ وه‌ربگرێ !!

كه‌واته : با خوانه‌ناس و بێ بڕوایانی نزم و په‌ست

ئاژەڵانەیان دا بەجێ بهێڵین و ، سەرنج بدەین داخــــوا
حیکمەتی ( ئینسان بوون ) ی پێغەمبەران چی یە ؟!
دەتوانین لە چەند خاڵێک دا ئەم مەسەلەیـــــە ڕوون
بکەینەوە :
یەکەم : وەک لە باسی چوارەم دا ڕوونی دەکەینەوە گەورەترین
حیکمەت و ئامانجی نێررانی پێغەمبەران صلی الله علیهم وسلم
بریتیە لە بڕوبەهانە نەهێشتن ( إتمام الحجة ) ی خەڵکــی،
وەک فەرموویەتی :( رسلا مبشرین ومنذرین لِئَلَّا یکون للنـــاس
علی الله حجةٌ بَعْدَ الرسل .. ) النساء / ١٦٥ .
دەجا گومانیشی تێدا نیە کە تەنیا کاتێک وەک پێویست
( إتمام الحجة ) لەسەر خەڵکی دەکرێ و بڕوبەهانەیـــان
ناهێڵرێ کە پەیام و بانگەوازی خوایان بەتەواوی پــێ ڕا
بگەیەنرێ ، پەیام و بەرنامەی خواش ناگونجێ وەک پێویست
بە خەڵکی ڕابگات ، هەتا وێڕای زمانی وتار ( مقال ) بــە
زمانی کردار ( حالْ ) یش لە شێوەی واقیعێکی زینـــدوودا
نەخرێتە بەرچاویان ، ئەمەش بەس لە حاڵێک دا دەکرێ کە
ئەو کەسەی پەیام و بەرنامەی خوای هەڵگرتوە لە جینـــس و
سروشت و ڕەگەزی ئەو خەڵکە بێت و ، بەر لە هەموو شتێـــک
بۆخۆی بەو بەرنامەو پەیرەوەوە پابەند بێت ، هەڵبەتـــە
هەربۆیەش لە سوورەتی فاتیحەدا دوای ( إهدنا الصـــراط
المستقیم ) ڕستەی ( صراط الذین أنعمت علیهم ..) هاتوە!
دووەم : حیکمەتی دووەمی ( ئینسان بوون ) ی پێغەمبـــەران
ئەوەیە ، کە ئایین و پەیامی خوا بەرنامەو پەیرەوێکـــی
فراوان و هەمەلایەنەیی ژیانە ، هەر لە قسەکردن و خواردن و

خواردنەوەو نووستن و هەستان و دانیشتن و بەڕێگادا ڕۆیشتنو دەستنوێژ گرتن و خۆشوردنەوە بیگرە هەتا حاڵەتی جەنگ و ئاشتی و حوکم گێڕان و پەیوەندی نێوان دەوڵەتان !

دەجا بێگومان پێشاندان و دەرەوشانەوەی بەرنامەیەکــی ئاوا لەسەر ڕووپەڕی کردەوەو ئاکاران و لە مەیدانی واقیعو ژیان دا ، حەوجێی بە پێغەمبەرێکی ئینسان هەیە ، کە هەموو ئەو هەڵس وکەوت و دیاردەو ئاکارانەی لە ژیانی خەڵکی دا دەبینرێن ، لە ژیانی ویش دا بەگوێرەی بەرنامەی خــواو لە جوغزی شەرع و ئایینەکەی دا ببینرێن ، تاکو خەڵکــی بتوانن لە هەموو وردو درشتی ژیانیان دا بیکەنە سەرمەشقو چاوی لێ بکەن ، وەک خودا فەرموویەتی :( لقد كان لكم في رسول الله أسوه حسنة .. ) الأحزاب / ۲۱ .

سێ یەم : سێ یەمین حیکمەت ئەوەیە ، کە ئەگەر هاتباو ئەو پێغەمبەرانە ئینسان نەبان - بۆ وێنە فریشتە بوونایــە - ئەوکاتە سەرەرای ئەوەی کە خەڵکەکە نەیاندەتوانی لێــی حاڵی بن و هەڵس و کەوتی لەگەڵ بکەن ، مەگەر لە حاڵێک دا کە بچووبێنرایە سەر شێوەی ئینسان ، کە دیارە لە حاڵێکی واش دا لەگەڵ ئینسانەکانی دیکە لێیان تێکەڵ دەبــوو و دەگۆڕا ، وەک خودا لەوبارەوە فەرموویەتی :

( ولو جعلناه مَلَكاً لجعلناهُ رَجُلاً وَلَلَبَسْنا عليهم مــا يَلْبِسون ) الأنعام / ۹ .

بەڵێ سەرەرای ئەوەش ئەو پێغەمبەرە فریشتەیی یانــە نەک هەر نەدەبوونە بیانووبڕی خەڵکی ، بگرە فریشتەیی بێتی ئەو پێغەمبەرانە دەبوو بە چاکترین بەڵگەو بیانووی دەستی

خەڵکی ، چونکە ئەو کاتە دەیانگوت :

جا خوایە ئێمە چۆن لە پێغەمبەرێکی فریشتەیی حاڵی بین ، بۆچی لە ڕەگەزو سروشتی خۆمانت بۆ نەدەناردین ؟!

یان جا خوایە ئێمە کوا وەک فریشتانمان پێ دەکـــــرێ ئەگەر پێغەمبەرەکەشمان فریشتە نەبووایە ، ئەویش هـــــەر وەک ئێمە دەبوو و ، نەیدەتوانی ئەو ئەرکە ( قورسە ! ) بەڕێوەبەرێ !!

# ٤

# پێغەمبەران بۆچی نێراون؟!

خوا پشتیوان بێ لەبەر تیشکی چەند دەق (نص) ێکی قورئان دا لە چەند خاڵێک دا وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەینەوە :

یەکەم : بەڵگەو بەهانە بەدەست خەڵکی نەهێشتن لەسەر گرتنی رێ ی چەوت و هەڵە :

خوای دادگەر لەوبارەوە فەرموویەتی :( رسلا مبشرين ومنذرين لئلا يكون للناس على الله حجة بعدَ الرسل وكان الله عزيزا حكيما ) النساء / ١٦٥ . واتە :

پێغەمبەرانێکی موژدەدەرو ترسێنەرن ، بۆئەوەی خەڵکی لەدوای - نێررانی - پێغەمبەران هیچ بەڵگەیان نەمێنن لەسەر خوا ، وە خوا زاڵ و کاربەجێ یە .(١)

دووەم : چەسپاندنی بیری خوا بەیەک زانین ( التوحيد ) و، ریشەکێش کردنی هاوبەش پەرستی ( الشرک ) :

خوای تاک و بێ وێنە لەوبارەوە فەرموویەتی :( وما أُرسلنا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رسول إلاّ نوحي إليه أنه لا إلهَ إلاّ أنا فاعبدون ) الأنبياء / ٢٥ . واتە :

---

(١) لەم ئایەتە دەفامرێتەوە کە عەقڵی ئینسان بەتەنێ بەس نیە بۆ بەرنامە دانان و بەرێوەچوونی بەشێوەیەکی ئینسانانە ، هەربۆیەش خەڵکی پێش هاتنی پەیام و بەرنامەی خوا بە پێغەمبەران دا صلى الله عليهم وسلم مافی گلەیی بسان هەیەو ، بەڵگەیان بەدەستەوەیە !!

وە بەرلەتۆ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوان نەکردوە مەگەر پێمان ڕاگەیاندوە کە بێگومان جگە لە من هیچ خوا نیین ، دەجا بمپەرستن !

سێیەم : بانگ کردن و کۆکردنەوەی خەڵکی لەسەر ڕاستەشەقامی خودا :

خوای چاکەکار لەوبارەوە فەرموویەتی : ( .. قد جاءكم مِنَ الله نور وكتاب مبين . يهدي به الله مَنِ اتَّبَع رضوانه سُبُل السلام ويُخرجهم مِنْ الظُلمات إلى النور بأذنه ويهديهم إلى صراط مستقيم ) المائدة / ١٥ ، ١٦ . واته :

بە تەئکید لەلایەن خواوە ڕووناکی و کتێبێکی ڕوونکەرەوە ـ تان بۆ هاتوە . خوا بەهۆی وی یەوە کەسانێک کە وەدوای ڕەزامەندی وی دەکەون بەرەو ڕێ یەکانی سەلامەتی ڕێڕوونی یان دەکات ، وە لە تاریکایی یانەوە بەرەو ڕۆشنایی دەریان دێنێ بە فەرمانی خۆی ، وە بەرەو ڕاستەشەقامێک ڕێڕوونی ـ یان دەکات .

چوارەم : نەهێشتنی ستەم و چینایەتی و خراپەو ، چەسپاندنی دادگەری و یەکسانی و چاکە :

خوای دادگەر لەوبارەوە فەرموویەتی : ( لقد أرسلنا رُسُلنا بالبيِّنات وأنزلنا معهم الكتاب والميزان ليقوم الناس بالقسط وأنزلنا الحديد .. ) الحديد / ٢٥ . واته :

بێگومان پێغەمبەرانی خۆمانمان بە موعجیزەوە ناردوون وە کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونەخوار ، بۆئەوەی خەڵکی بە دادگەری بەڕێوەبچن ، وە ئاسنیشمان ناردۆتە خوارێ .. ( چونکە چەسپاندنی دادگەری و لابردنی ستەم بەبێ هێز ناکرێ ) .

پێنجەم : بوونە پێشڕەوو سەرمەشق بۆ خەڵکی :

خوای بەرزو مەزن لەوبارەوە فەرموویەتی :

( لقد كان لكم في رسول الله أسوة حسنة لِمَن كان يرجوا الله واليوم الآخر وذكر الله كثيرا ) الأحزاب / ٢١ .

واتە :

بێگومان لە پێغەمبەری خوادا بۆ ئێوە سەرمەشقی یەکی چاک هەیە ، بۆ کەسێک کە بە ئومێدی ـ پاداشتی ـ خواو رۆژی دوایی بەو زۆر یادی خوا دەکات .

لەڕاستی دا مەسەلەی سەرمەشقی و پێشڕەوایەتی لە ژیانی ئینسان دا شتێکی یەکجار گرنگ و کاریگەرە ، چونکە ئەوەی کە هەر لە بەرایی مێژووی مرۆڤایەتی یەوە بۆتە کۆسپ و تەگەرەو گرێ پووچکەی ژیانی تاکی و کۆمەڵایەتی و ماددی و مەعنەوی ئینسان بریتی بووە لە نەتوانینی پێوەپابەند ـ بوون و جێ بەجێ کردنی ئەو یاساو دەستوورانەی کە لەرێ ی شەرع و عەقڵەوە لە ڕاستیی و تەواوی ی یان دڵنیاو مسۆگەر بووە !!

بێگومان تاقە هۆی ئەو نەتوانینەش بریتی بووە لە ، زاڵبوونی ئەو هەواو ئارەزوو و داخوازی یە بەدو ناشەرعی ـ یانە کە لە زبلدانی نەفسی فەرمان بە خراپەکەر ( الأمارة ) و خوتخوتەو دنەدانی شەیتانی لەعینەوە پەیدابوو ون ، جا لەسۆنگەی ئەوەوە کە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام خاوەنی دڵ و دەروونێکی پاک و عەقڵ و هۆشێکی زۆر چاک بوو ون ، بە یارمەتی خوا توانیویانە کە ١٠٠% مەبەستی نێو دڵ و قسەی سەر زمان و کردەوەی ئەندامەکانیان یەک بن ، لە هەموو بوارو لایەنەکانی ژیانی تاکی ی و

کۆمەڵایەتی یان دا ، لەسۆنگەی ئەمەشەوە توانیویانە ببنە چاکترین و ڕاستترین پێشڕەوو سەرمەشقی مرۆڤایەتی .

شەشەم : ئاگادارکردنەوەی خەڵکی لە حەقیقەتی ژیانی دنیای تەمەن کورتی فریودەر :

خوای میهرەبان لەوبارەوە فەرموویەتی :

( وما هذه الحياة الدنيا إلاّ لَهوٌ ولَعِب ، وإن الدار الآخرة لَهِيَ الحَيَوان لو كانوا يعلمون ) العنكبوت / ٦٤ .

واتە :

وە ئەم ژیانە دنیایی یە جگە لە خۆخافڵاندن و یاری چیدی نیە ، وە بێگومان بەس- ژیانی - مەنزڵی دوارۆژ ژیانی ڕاستەقینەیە ، ئەگەر بزانن !

بەڵێ بێگومان فەراموٚش کردنی مردن و لەبیرچوونەوەی ئامانج و مەبەستی ژیانی دنیا - کە تاقیکرانەوەیە - و زیاد لە پێویست سەرگەرم بوون و فریوخواردن بە جوانی و زەرق و بەرقی ڕواڵەت و کەم و کورت و کەم ماوەی ژیانی دنیا ، کۆمەڵە نەخۆشی و دەردێکی یەکجار بێزراو کوشندەن و ، مرۆڤایەتی زۆر حەوجێی بەو زاتە بەرزانەیە کە نێونێوە نقورچکی وریاکردنەوەی لێ بدەن و نەیەڵن پێنج و دوو ڕۆژی ژیانی دنیا بیکاتە دیلی خۆی و نەبێتە کۆیلەی نەفس و ئارەزووەکانی ، کە سەرجەمی دەردو نەخۆشییە تاکی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری یەکانیش هەر لێرەوە سەر هەڵدەدەن و پەیدادەبن .

حەوتەم : سەرنج ڕاکێشانی مرۆڤ بۆ سەرەتا و سەرەنجامی و کارەساتەکانی دوای مردن :

خوای خاوەن لوتف و بەزەیی لەوبارەوە فەرموویەتی :
( یا مَعشرَ الجنِ والأنس أَلَمْ یأتِکُم رُسُلٌ منکم یَقُصّون علیکم آیاتي ویُنذرونکم لِقاءَ یومِکُم هذا ؟ قالوا شهدنا علی أنفُسِنا وغرّتهم الحیاةُ الدنیا وشهدوا علی أنفسهم إنهم کانوا کافرین .. ) الأنعام / ١٣٠ . واتە :
ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ ! ئەدی پێغەمبەرانێک لەخۆتان نەهاتنە لاتان ، کە ئایەتەکانی منیان بەسەردا دەخوێندنەوەو ، لە دیداری ئەم ڕۆژەتان دەیان ترساندن ؟! گوتیان : شایەدی لەسەر خۆمان دەدەین ، وە ژیانی دنیا فریوی دان ، وە شایەدی یان لەسەر خۆیان دا کە بێ بڕوا بوون ( بۆیە بەو دەردە چوون ) .
بەڵێ خوێنەری بەڕێز !
یەکێ دیکە لە ئامانج و مەبەستە هەرە گرنگەکانی نێررانی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام بریتی بووە لەوەی کە سەرەتا ( مبدأ ) و سەرەنجام ( مصیر ) بخەنە بەرچاوی خەڵکی و ، تەنیا ئەم قۆناغە کورتەی ژیانی دنیا نەبینن و بەبین بەبین چاوێک بە ڕابردوویان دا بگێڕنەوەو جاروبار ، سەر بەرزبکەنەوەو ئەوپەڕو کۆتایی و سەرەنجامی ژیانی دنیا و قۆناغەکانی دوابیشی ببینن و ، هەروەک چۆن خەمی ئەم چەند ڕۆژەی ژیانی دنیایان دەخۆن و ڕەنجی بۆ دەدەن ، ژیانی دواڕۆژیش لەبیرنەکەن و لە گەرمەی جم و جۆڵ و چالاکی یەکانی ئەم ژیانەیان دا ، ژیانی ئەو دنیاش لەبەرچاو بگرن و بیرێکی دوای مردن و گۆڕەیانی قیامەت و ڕاوەستانی بەردەمی دادگای خواو پەڕینەوەی پردی سەرپشتی دۆزەخیش بکەن !

# ئەرکە نووسینەکانی پێغەمبەران صلی اللە علیهم وسلم چین ؟!

خوێنەری بەڕێز !

خوای دادگەرو کاربەجێ کە خاوەنی ئەوپەڕی زانیاری و بەزەیی و کارزانی و دادگەری یە ، قەت ئەوەی لێ چاوەڕوان ناکرێ کە کارێک بە کەسێک بسپێرێ ، توانای جێ بەجێ کردنی نەبێت ، چونکە ئەو بۆخۆی بەندەکانی فێرکردوە کە لێی بپاڕێنەوەو بڵێن :( .. ربّنا ولاتُحَمِّلْنا مالا طاقة لَنا بِهِ .. ) البقرة / ٢٨٦ . واتە : .. پەروەردگارمان وە شتێکمان لێ داوا مەکە کە توانامان پێی نەشکێ ..

وە بۆخۆشی فەرموویەتی :( لایُکَلِّفُ اللهُ نفسا إلاّ وُسعها .. ) البقرة / ٢٨٦ . واتە : خوا داوای - هیچ شتێکی - لە توانا بەدەر لەکەس ناکات ..

جا بێگومان پێغەمبەرانیش علیهم الصلاة والسلام وەک لە باسەکانی ڕابردوودا خستمانەڕوو بارێکی یەکجار قورس و ئەرکێکی زۆر گرنگ و مەترسی داریان پێ سپێرراوە ، کە دەتوانین بۆ زێدە ڕوون بوونەوە لەچەند خاڵێکدا بیخەینەڕوو :

١- پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام چەند بەندەیەکی دانستەو شایستەن کە خوا هەڵی بژاردوون و وەحی بۆ ناردوون .

٢- یاساو دەستوورەکانی شەرع و بەرنامەی خوا بە خەڵکی ڕادەگەیەنن .

٣- بانگەوازی خەڵکی دەکەن بۆلای خوا .

٤ـ بە فەرمانی خوا گوێ ڕایەڵی و فەرمانبەری یان لەسەر ئوممەتەکانیان فەرزە .
٥ـ خوا گێڕاونی بە پێشەوا و سەرمەشقی خەڵکی لە هەموو بوارو لایەنەکانی ژیان دا .
٦ـ ڕابەرو مشوورگێڕی مرۆڤایەتین و پێویستە لە هەموو ڕوویێکەوە بەسەر خەڵکی ڕابگەن و گیروگرفتە فیکری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری یەکانیان بەپێی توانا و بەگوێرەی بەرنامەی خوا چارەسەر بکەن .
٧ـ هەواڵی مەسەلە پەنهانەکانی وەک سەرەتا ( مبدأ ) و سەرەنجام ( مصیر ) و ، ژیانی نێو گۆڕو بەرزەخ و ، ڕۆژی دوایی و کارەساتە گرنگ و سامناکەکانی و چۆنیەتی کۆکردنەوەو لێپرسینەوە ( الحشر والحساب ) و بەهەشت و دۆزەخ ـ بەناوی خواوە ـ بەخەڵکی ڕادەگەیەنن .

ئنجا شتێکی ئاشکراشە کە هەرکام لەم ئەرکانە شتێکی یەکجار گرنگ و قورسەو هەرکەسێک وەئەستۆی بگرێ حەوجێ ی بە چەند خەسڵەتێکی تایبەتی و گرنگ دەکات ، چ جای هەموویشیان !!

هەربۆیەش خوای میهرەبان و کاربەجێ ( سبحانه وتعالى ) بە لوتف و بەخششی خۆی پێغەمبەرانی پایەبەرزی علیهم الصلاة والسلام بەچەند سیفەتێکی گرنگ و مەزن ڕازاندۆتەوەو بەهرەمەند کردوە ، کە ئەو خەسڵەت و ئیمتیازە بەرزو پەسندانە بوونە هۆی ئامادەیی و لێوەشاوەیی ئەو زاتە پایەبەرزانە بۆ ئەنجام دانی ئەرکی سەرشانیان .

جا هەرچەندە زاناو توێژەرەوان بەتایبەتی زانایانی ( علم الكلام ) لە چۆنیەتی ڕیزکردن و ژماردنی ئەو خەسڵەتانەدا هەندێک جیاوازی لەنێوانیان دا هەیە ،

بۆ وێنە زۆربەیان لەسەر ئەو ڕایەن کە ( فطانة و أمانة و صدق و تبلیغ ) ئەو خەسڵەتە بەرزە تایبەتیو پێویستانە پێک دێنن ، بەڵام ئەوەی لە قسەی تێکڕای زانایـــــان وەردەگیرێ و لەئەنجامی تیێوەڕامان ( إستقراء ) ی حاڵ و واقیعی پێغەمبەرانەوە دەستگیر دەبێ ، ئەوەیە کە هەمـــوو ئەو مەرج و خەسڵەتانەی کە لەم چەند خاڵەدا دەیانخەینەڕوو ، لەهەموو پێغەمبەران دا علیهم الصلاة والسلام هەبوون و ، پێویستیش بووە هەبن :

یەکەم : ( ئینسان بوون ) ، هۆو حیکمەتی ئینسان بوونی ئەو زاتانەش پێشتر خرایەڕوو .

دووەم : ( پیاوبوون ـ الرجولة )،ئەمیش لەبەرئەوەی کە سروشت و پێکهاتنی جەستەیی و دەروونی و عەقڵیی ئافـــرەت لەگەڵ ئەرک و پایەی پێغەمبەرایەتی دا ناگونجێ .

سێیەم : نیشتەجێ بوویێتی ، ئەم خەسڵەت و مەرجەش لـــەزۆر ئایەتی قورئان و لە حاڵ و واقیعی پێغەمبەرانیش دا دەبینرێو حیکمەتەکەشیمان باس کرد .

چوارەم : خەسڵەتی ( الفطانة ) ، کە بەمەعنای عەقـــڵ و تێگەیشتن و وریایی دێ و[1] ، پێچەوانەی گێلـــــی ی و کەودەنی و فەقیرحاڵی یە .

پێنجەم : خەسڵەتی ( الأمانة ) ، کە بەمەعنای دڵ و دەسـت و زمان پاکی دێ و ، پێچەوانەی ( خیانة ) ناپاکی یە ، چونکە وشەی ( أمانە )[2] لە ئەسڵ دا لە ( أمن ) ەوە هاتـــوە

---

(١) بڕوانە ( لسان العرب ) ج١٢ ص ٣٢٣ / ابن منظور .

(٢) سەرچاوەی پێشوو / ص ٢١ ، ٢٤ .

كه به ماناى دلّنيايى و بىّ باكى دىّ ، كەواتە ئينسانى ( أمين ) ئەو كەسەيە كە لە شەڕو خراپەى دلّ و زمان و ئەندامەكانى دلّنياو بىّ ترس و بيم بن و ، ( خائن ) يش بەپيّچەوانەوە .

شەشەم : خەسلّەتى ( الصدق ) ، واتە : ڕاستى ى ، بەلاّم نەك تەنيا ڕاستى ى زمان ، وەك زۆر كەس وا حالّى بوو ون و بەهەلّە لەبەرانبەر وشەى ( صدق ) دا ( ڕاستگۆيى) دادەنێن ، بەلّكو ( صدق ) ڕاستى ى دلّ و زمان و ئەندامەكان ، يان ڕاستى ى دەرو دەروون ( ظاهر و باطن ) دەگەيەنىّ .

حەوتەم : سيفەتى ( التبليغ ) ، واتە : ڕاگەياندنى بەرنامەى خوا ، بە زمانى گوتارو كردار ( المقال والحال ) ، وە نەشاردنەوەو پشت گوىّ نەخستنى گچكەترين شتيش .

هەشتەم : سيفەتى ( العصمة ) ، واتە : پاريّزران لە خراپەو تاوانى گچكەو گەورە ، وشەى ( عصمة ) يش لە ئەسلّى زمان دا بە مەعناى پێشگيرى لىّ كردن ( منع ) ديّت ، بەلاّم پێشگيرى كردنێك كە ببێتە هۆى پاراستن ( حفظ ) ، بەلاّم لە زاراوى شەرع دا بريتيە لەوەى كە خواى ميهرەبان يەكێك لە بەندەكانى خۆى لە هەلّەو تاوانى گەورەو گچكە بپاريّزىّ ، دەربارەى ( عصمة ) ى پێغەمبەرانيش صلى الله عليهم وسلم تێكڕاى زانايان لەوەدا يەكدەنگن كە ئەو زاتە بەرزانە بەر لە پێغەمبەرايەتى و دواى پێغەمبەرايەتى لە گوناحى گەورە پاريّزراون ، بەلاّم سەبارەت بە پاريّزراتى لە وردە گوناحان چ پێش پێغەمبەرايەتى و چ لەدوايەش لەنێو زانايان دا مشتومڕ هەيەو رايان جياجيايە .

( قرطبي ) لەوبارەوە لە تەفسيرى(الجامع لأحكام القرآن)دا

فەرموویەتی :

(( وە زانایان دوای ئەوەی تێکڕا لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام ، لە گوناحە زلەکان ( الکبائر ) و لە هەر خەسڵەتێکی نزم کە ناشیرینی و ناتەواوی ی تێدابێ پارێزراون ، لەوەدا کە ئایا گوناحی گچکە لیێ ڕوودەون یان نا ؟ مشتومڕیان لەنێوان دا هەیە ، جەماوەری شەرع زانان ( جمهور الفقهاء ) فەرموویانە : کە وەک چۆن لە گوناحە زلەکان پارێزراون بەهەمان شێوەش لە تێکڕای گوناحە گچکەکانیش پارێزراون ، چونکە ئێمە فەرمانمان پێکراوە کە شوێنیان بکەوین لە کردەوەو پەرێزو ئاکاریان دا ، ئەو فەرمان پێکرانەش بە موتڵەقی یەو بە هیچ نیشانە ( قرینة ) یەکەوە نەبەستراوەتەوە ، جا ئەگەر بێت و بڵێین دەگونجێ گوناحی گچکەیان کردبێ ، ئەوە ناتوانین بیانکەینە سەرمەشق و پێشڕەو ، چونکە مەرج نییە هەموو کردەوەیەک لە کردەوەکانیان بۆ ئێمە جیا بێتەوە داخوا کاتی خۆی بەمەبەستی لەخوا نیزیک بوونەوە کراوەو ئێستاش حەڵاڵە ، یان کاتی خۆی خراپەو گوناح بووەو ئێستا قەدەغەیە ، دیارە لە حاڵێکی واشدا ناگونجێ فەرمان بە ئینسان بکرێ ، چونکە دەبینی تاوان و خراپەیە !!

( أبو إسحاق الأسفرايينی ) یش لە زانایانی ( أهل السنة ) فەرموویەتی : پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام هیچ جۆرە گوناحێکیان لێ ڕوونادات ، چونکە لە گوناحە وردو درشتەکان پارێزراون ، ئەمەش داخوازی ی بەڵگەی موعجیزە بەدەستەوە بوونە ، هەندێکیش گوتوویانە : دەگونجێ وردە گوناحیان هەبووبن ، بەڵام ئەم قسەیە هیچ بنچینەیەکی نییە ، وە ئەوەی

کە زۆربە لەسەرنی ئەوەیە کە دروست نیە گوناحی گچکەشیان هەبێ .

وە هەندێک لە زانایانی دوایی ( المتأخرین)گوتوویانە : ئەوەی شایانی باسە ، ئەوەیە کە خوای بەرز هەواڵـی داوە کە هەندێکیان گوناحیان کردوون ، وە گوناحەکانی پاڵداوەتە لایان و لەسەر ئەوە سەرکۆنەشی کردوون ، ئەوانیش ئـەو گوناحانەیان بە ئی خۆیان داناون و، نارەزاییان دەربارە دەربریون و، لێیان ترساون و لێیان ژیوان بوونەوە ، هەموو ئەم بابەتانە لە زۆر جێ یان دا هاتوون و هەموشیان پینـە ناکرێن ، ئەگەر هەندێکیشیان تەئویل هەڵبگرن ، بەڵام هەموو ئەوانەش لە پلەوپایەی وان داناشکێنێ ، چونکە ئەو هەڵەو پەڵانە لەرووی غەڵەت و لەبیرچوونەوەوە بوو ون و ، هەرچەندە بۆ وان بە خراپە ( سیئة ) لەقەڵەم درابن ، بۆ غەیری وان بە چاکە ( حسنة ) دادەنرێن ، ( جُنَیْدْ ) یش چاکی فەرمووە کە گوتوویەتی :( حَسنات الأبرار سیئات المقربیـن ) چونکە ئەوەی کە کرێکار ( أجیر ) لەسەری خەڵات دەکرێ ، وەزیـر لەسەری سزا دەدرێ ، ( قرطبي ) دەڵێ : بێگومان هەر ئەمەش ڕاستە ، چونکە ئەو زاتانە صلوات الله وسلامه علیهـم هەرچەندە چەند دەقێک شایەدی یان داوە کەهەندێک هەڵەیان کردوون ، بەڵام ئەوە لە شانی وانی نەهێناوەتەخـوارو لە پلەوپایەیانی دانەشکاندوە ، بەڵکو خوا لەسۆنگـەی ئەوەوە دەفریایان هاتوەو هەڵی بژاردوون و ، ڕێڕوونـی کردوون و پاکی کردوونەوەو ، پەسندی کردوون و بـەرزی کردوونەوە ، صلوات الله وسلامه علیهم )) .[1]

---

(1) بروانە ( الجامع لِأحکام القرآن ) ج1 ص ٣٠٨ ، ٣٠٩ . بەتۆزێک کورتکردنەوە ( إختصار ) وە .

هەرچەندە تویژینەوەی ئەم سیفەتە لەچاو سیفەتەکانی دیکە زۆری گرت ، بەلام پیویستە چەند شتیکی دیکەش هەر بخرینەروو :

یەکێ : بیجگە لە پیغەمبەران علیهم الصلاة والسلام هیچ کەس پاریزراو ( معصوم ) نیەو ، ڕێ ی تێ دەچێ و دەگونجێ تووشی هەلەو تاوان ببێ ، با لە واقیع و ( نفس الأمر ) دا تووشیش نەبیت ، وە ئەوەش کە مسولمانانی ( شیعە ) دەیلین کە گوایە هەرکام لە دوازدە[1] پیشەوایەکانیان هەر لە ( علي بن أبي طالب ) ەوە بگرە رضي الله عنه هەتا ( محمد ابن حسن العسكري ) کە بە ( المهدي المنتظر)ی ناودەبەن ، لە هەموو هەلەو ناتەواوی یەکان پاریزراون ، هیچ بەلگەیەکی عەقلی و شەرعی ڕاستەقینەی لەسەر نیە ، ئیمام ( مالك ) یش لەوبارەوە جوانی فەرمووە :( ما مِنّا إلا من رد ، ورُدّ عليه إلّا صاحب هذا القبر ) واتە پیغەمبەر عليه الصلاة والسلام .

دوو : تەنیا لە ئیسلام دا ڕیزو حورمەتی تەواو بۆ پیغەمبەران علیهم الصلاة والسلام دانراوە ، دەنا لە ( تەورات و ئینجیل ) ی ئیستای دەستی جوولەکەو دیانەکان کە دەستکاری کراون و گۆڕراون شتی زۆر بێ جێ و ناقۆلا کە تەنانەت لە مسولمانی سادەو ئاساییش ناوەشیتەوە ، پالدراوەتە لای ئەو زاتە بەرزانە ، بۆ وینە : مەیخواردنەوەو

---

(١) بیگومان هەرکام لەم دوازدە زاناو پیشەوایە لەلای ( اهل السنة ) ش جێی ڕیزو حورمەتن ، ئەوەندە هەیە ئیمە جگە لە پیغەمبەران هیچ کەس بە ( معصوم ) نازانین ، تەنانەت چوار جێ نشینەکانیش کە بە ( الخلفاء الراشدون) ناسراون ، چونکە بەلگەیەک لەوبارەوە شک نابەین .

زیناکردن لەگەڵ کچی خۆدا پاڵدراوەتە لای ( لوط ) علیە السلام !! [1] وە گوتراوە کە گوایە ( داود ) علیە السلام لەگەڵ ژنی ( ئۆریا ) دا زینای کردوەو [2] ئاوسیش بووە، لەحاڵێک دا کە ( ئۆریا ) سەرکردەی سوپای ( داود ) بووە! وە گوتراوە کە گوایە ( سلیمان ) لە دوادوای تەمەنی دا هەڵگەراوەتەوەو دەستی کردوە بە بتپەرستی !! [3]

ئەمە سەبارەت بە جوولەکە ، دیانەکانیش گومانیان وایە کە جگە لە ( مسیح ) علیە السلام کە تاقە پارێزراو ( معصوم ) ە ، تێکڕای ئینسانەکان ، پێغەمبەرو غەیری پێغەمبەر گوناح و تاوانان دەکەن ، تەنیا ( عیسا ) ش دەبێتە تکاکارو ڕزگارکەری ئەو تاوانبارانە، وەک ئینجیل دەڵێ !! [4]

نۆیەم : دووری لەهەر عەیبێکی خەڵک ڕەوێنەرەوە ( السلامة مِنَ العیوب المُنَفِّرة ) ، جا ئەو عەیب و ناتەواوی یە چ جەستەیی ( خَلْقي ) بێ ، چ دەروونی ( خُلُقي ) ، وەک سیلداری و گولی و بەڵەکی و ، ڕژدی و ترسنۆکی و تەنگە پریشکەیی .

کەواتە ئەوەی کە دەربارەی ( أیوب ) علیە السلام لە هەندێک کتێبان دا گێڕراوەتەوە کە گوایە کرمێ و بۆگەنیو بووەو تەنانەت لەبەرچاوی هاوسەرە ئارامگرەکەشی بێزراوە!! هیچ گومانی تێدا نیە کە درۆو دەلەسەی ڕووتەو، یەکی دیکەیە

---

(١) بڕوانە ( التوراة ) سفر التکوین ص ١٢٨ .
(٢) سەرچاوەی پێشوو ( الباب الحادي عشر ) مِنْ سفر صموئیل .
(٣) سەرچاوەی پێشوو ( الباب الحادي عشر ) مِنْ سفر الملوک .
(٤) بڕوانە ( النبوة والأنبیاء ) محمد علي صابوني ص ٦٧ .

لەو شتە پڕووپووچانەی کە بە ( إسرائیلیات ) ناسراون و، لەلایەن هەندێک کەسی دڵساف و سادەو لاساکەرەوە تێکەڵ بە کتێبەکانی مێژوو و تەفسیر کراون ، بەڵگەشمان ئەوەیە کە:
أ ــ خوا پێغەمبەرانی پایەبەرزی بۆیە ناردوون تاکو خەڵکی بەرەوخوا بانگەواز بکەن و بەرنامەی خوایان لەلا شیرین بکەن ، کەواتە : هیچ ماقووڵ نیە ئەو ئەرکە بەرزو پیرۆزە بەکەسێک بسپێررێ کە نەک هەر نەبێتە هۆی سەرنجڕاکێشانی خەڵکی ، بەڵکو ببێتە هۆی ڕەواندنەوەو سڵەمینەوەیان !
ب ــ ئەو نەخۆشیەی کە ( أیوب ) تووشی بووە ، قورئان ئاوای باسکردوە :( وأیوب إذ نادیٰ ربّهٗ إني مسّنيَ الضُرُّ وأنت أرحم الراحمین ) الأنبیاء / ٨٣ . واتە : وە ئەیوب لەکاتێکدا بانگی پەروەردگاری کرد ، کە من ئازارو ناخۆشیم تووشبووە ، وە تۆش میهرەبانترینی میهرەبانانی .
وەک دەبینین هیچ باسی گول بوون و کرمێ بوون و ... شتی وای تێدا نیە .
ئێستاش بەپێویستی دەزانم بەرلەوەی ئەم باسە گرنگە بەجێ بهێڵین ، جارێکی دیکە سەرنجی ئەو خەسڵەتە بەرزە تایبەتی و پێویستانە بدەینەوەو بزانین لەبەرچی هەبوونیان لە پێغەمبەراندا علیهم الصلاة والسلام شتێکی گرنگ و پێویستە !
جارێ دەربارەی خەسڵەتی یەکەم و دووەم و سێیەم ( ئینسانێتی و پیاوێتی و نیشتەجێ یی ) ، ئەوە لەڕابردوودا شتێکمان خستەڕوو و هەر ئەو ئەندازەیەش بەپێویست دەزانم . بەڵام سەبارەت بە هەرکام لە خەسڵەتی ( فطانة و أمانة

و صدق و تبليغ ) دەڵێين :

هيچ ماقووڵ نيە باباپەک ئەركى پێغەمبەرايەتـــى پێ بسپێررێ ـ ئەو ئەركەي كە لەسەرەتاى باسەوە لــە (٧) خاڵان دا خستمانەڕوو ـ كە خاوەنى ئەوپەڕى عەقڵ و بيرتيژىو زەين ڕوونى و وريابى و ليژانى نەبێ ، چونكە ئەركى ناوبراو وا داخواز دەكات كە باباى پێغەمبەر عليه الصلاة والسلام لەهەموو بوارەكانى فيكرى و ئەخلاقى و كۆمەڵايەتىو سياسى و ئابوورى دا واقيعى خەڵک و كۆمەڵگا بگۆڕێ و ، سەرلەنـوێ لەسەر بنچينەى بەرنامەو پەيرەوى خوا هەوڵى چاككـــردن و دامەزراندنەوەى بدات و ، ديارە لە حاڵێكى واش دا ئــەو پێغەمبەرە لەگەڵ دەيان جۆرە كۆسپ و تەگەرەو گيروگرفتــى ئايديۆلۆژى و كۆمەڵايەتى و سياسى دا ڕووبەڕوو دەبێتەو ، ئەگەر بێت و عەقڵ و هۆشێكى يەكجار تيژروتەواوى نەبێـت ، ناتوانێ ئەركى خۆى جێ بەجێ بكات ، ديسان هەركام لــە ( أمانە و صدق و تبليغ ) يش بەهەمان شێوە ، چونكــــە باباپەک خەڵک تێيرا نەبينن بيكەنە ئەميندارى خۆيـان و متمانە بە قسەو وتاروكردارى نەكەن و ، توانای ڕاگەياندنى بێ پێچ و پەناى بەرنامەو بانگەوازى خواى نەبێت ، ناتوانێ ئەو ئامانج و مەبەستەى كە بۆى نێرراوەو ئەو ئەركەى كە پێى سپێرراوە بيهێنێتەدى و ، لە حاڵێكى واش دا حيكمەتـى ڕەوانەكرانى ئەو زاتە دەفەوتێ و ، بێگومان خواى زانــاو كاربەجێش ، كارى بى حيكمەت و بى سوودى لێ ناوەشێتەوە .

سەبارەت بە خەسڵەتى هەشتەميش ( عصمة ) پێم وايـــە ئەوەندە قسانەى كە لە ( قرطبي ) يەوە نەقڵمان كـردن ، مەدارى ئێمەيان لەوبارەوە ساز كردوەو بەپێويستى نازانـم

چیدی لەسەر بڕۆین .

دەربارەی خەسڵەتی نۆیەمیش وەک پێشتر گوتمـــان ، پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام ئامانجی هەرە سەرەکـی و بنەڕەتی یان بانگکردن و سەرنج ڕاکێشانی خەڵکی یـەو ، دیارە هەموو ئەو عەیب و ناتەواوی یە جەستەیی و دەروونـی - یانەش کە دەبنە هۆی سڵەمینەوەو دوورکەوتنەوەی خەڵک ، پێچەوانەی ئەو ئامانج و مەبەستە گرنگ و سەرەکی یەن کـە ئەو زاتە بەرزانەی بۆ ڕەوانەکراون .

٦

# تایبەتمەندی یەکان . خصائص . ی بانگەوازی پێغەمبەران کامانەن ؟!

خوێنەری خۆشەویست !

بۆئەوەی چاکتر جۆرو چۆنیەتی کەسایەتیی پێغەمبەرانمان علیهم الصلاة والسلام بۆ ڕوون بێتەوە ، پێویستە هەوڵ بدەین زیاتر لە جۆرو چۆنیەتی بانگەوازەکەیان وردبینەوە ، جا خوا پشتیوان بێ هەوڵ دەدەین کە لەم باسەدا لەچەند خاڵێکدا تیشکێک باوێینە سەر گرنگترین و سەرەکی ترین ئیمتیازو تایبەتمەندی یەکانی بانگەوازو خەت و ڕێبازی ئەو زاتە بەرزو پەسندو پێشەواو سەرکردە دڵگیرو ڕەندانە صلوات الله وسلامه علیهم أجمعین .

یەکەم : یەکەمین و بنەڕەتی ترین ئیمتیازو تایبەتمەندیی بانگەوازو ڕێبازی پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوا ئەوەیە کە : بانگەوازو ڕێبازێکی خوایی یە ، واتە : لەخوای پەروەردگارە ـ وە سەرچاوەی گرتوە نەک لەخۆیانەوە یان سەرچاوەیەکی دیکەوە ، وە خواش بەو کارە ڕای سپاردوون و لەسەری پێویست کردوون ، نەک بۆخۆیان حەزیان لێ کردبێ و هەڵیان بژاردبێ !

دەقی قورئانیش لەوبارەوە زۆرن بۆ نموونە :

أ ـ ( قل لو شاء الله ماتَلَوْتُهُ علیکم ولا أدراکم به ، فقد لَبِثْتُ فیکم عُمُرا مِنْ قبله أفلا تعقلون ؟! ) یونس / ١٦ .
واتە : بڵێ ئەگەر خوا ویستبای بەسەرمدا نەدەخوێندنەوەو

لەبارەشیەوە شارەزام نەدەکردن ، چونکە پێش ـ هاتنی ـ وی تەمەنێک ـ ی چل ساڵە ـ م لەنێودا گوزەراندوون ، ئایـا نافامن ؟! ( کە ئەگەر قورئانی خۆم بوایە پێشتـر بەسەرم دا دەخوێندنەوەو پێم رادەگەیاندن ! ) .

ب ـ ( وكذلك أُوحينا إليك روحا مِنْ أمرنا ، ماكُنتَ تـدري ما الكتاب ولا الأيمان .. ) الشورى / ٥٢ . واتە :
وە ئاوا بە فەرمانی خۆمان ڕووحێکمان بۆلا ناردی ، کە تۆ نەتدەزانی نە کتێب چی یەو نە بڕوا ..

جـ ـ ( قل مايكون لي أن أبدله مِنْ تلقاء نفسي إنْ أتبع إلاّ ما يُوحى إليّ ، إنّي أخاف إن عصيتُ رَبيّ عذاب يومٍ عظيـم ) يونس / ١٥ . واتە : بلێ من بۆم نیە کە لەلایەن خۆمـەوە بیگۆڕمەوە ـ بە کتێب و بەرنامەیەکی دیکە ـ من بەس شوێن ئەو ـ پەیام ـ ە دەکەوم کە پێم ڕادەگەیەنرێ ، من ئەگـەر سەرپێچی لە پەروەردگارم بکەم لە ئازاری ڕۆژێکی مـەزن دەترسم !

بەڵێ بانگەوازی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام زادەو هەڵقوڵاوی بیرو هۆشی خۆیان نیەو ، لە ئەنجامی ئەزموون و تەجرەبەی زاتیی خۆیانەوەو ، هەستکردنیان بە بارودۆخی ناهەموارو گیروگرفت و دەردە فیکری و سیاسی و کۆمەڵایەتیو ئابووری یەکانی ئەو ژینگە ( بیئة ) یەوە کە تێیدا ژیاون، پەیدا نەبووە ، بەڵکو لە لوتف و بەزەیی و زانیاری بێ سنووری خواوە سەرچاوەی گرتوەو ، لەلایەن وی یـەوە وەک ئەرکێک پێیان سپێرراوە .(١)

---

(١) بڕوانە کتێبی ( النبوة والأنبياء ) محمد علی صابونی،.. ص ٣٤، ٣٥ . وە بڕوانە ( النبوة والأنبياء ) نووسینی : ابوالحسن الندويّ / ص ٣٥ ، ٣٦ .

هەڵبەتە ئەلێرەشدا وەڵامی پرسیارێکی گرنگ و مەتەڵێکی پێچراوەمان دەستگیر دەبێ ؛ ئەویش ئەوەیە : کە بۆچـــی پێغەمبەران - و شوێن کەوتووانی ڕەسەنیشیان - بەپێچەوانەی فەیلەسووف و سەرکردەو بلیمەتانی جۆراوجۆرەوە ، هیچ کاتێک ئامادە نەبوون کە لەبەرانبەر هیچ تەماعو ترس وەبەرنان ( تطميع و تخويف ) یێکدا هێندەی سەری دەرزی یەک لــــە بەرنامەو بانگەوازەکەیان کەم بکەنەوە ، یان بیگۆڕن ؟! [1]
دووەم : یەکی دیکە لە جیاوازی یە بنەڕەتی یەکانی بانگەوازی پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام لەگەڵ بانگەوازەکانـــی دیکەدا ، ئەوەیە کە هیچ کاتێک ئەو زاتە بەرزو بەڕێزانە چاوەڕوانی ی هیچ جۆرە ئافەرین و کرێ و پاداشت و مزەیەک لە هیچ کەس نەبوون بێجگە لەخوا - جل جلاله -، وەک خودا لەوبارەوە فەرموویەتی :( قل ما أسألكم عليه مِنْ أجر وما أنا مِنَ المتكلفين ) ص / ٨٦ . واتە : بڵێ هیچ جۆرە کـــرێ و پاداشتێکتان لێ داوا ناکەم ، وە من لە خوازەڵۆکان [2] نیم .
ئنجا هەر لێرەشدا بۆمان دەردەکەوێ کە بۆچـــــــی پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام - و شوێن کەوتوانــــی، ڕەسەنیشیان - توانیویانە هێندە بە بێ منەتی و ڕاشکاوی و لەخۆڕادیتوویی یەوە بانگەوازی خۆیان بکەن و ، بتوانـــن دەست لەچاوی شێریش بنێن ، بەڵێ هەرچی پاکە بێ باکە !

---

(١) بڕوانە ( تهذيب سيرة ابن هشام ) عبدالسلام هـارون ، ص ٦٤،٦٥ . وە بڕوانە ( الحرب النفسية ضد الأسلام في عهد الرسول في مكة )د . عبدالوهاب كحيل / ص ١٨١،١٨٢،١٨٣ .
(٢) خوازەڵۆک : بە ئینسانێک دەڵێن کە زۆر داوای شتـــی لە خەڵکی بکاو ببێتە مایەی سەرگــرانی وان و خۆســـووک کردنی خۆشی .

سێ یەم : یەکێ دی لە نیشانەو دروشمە تایبەتی یەکانی خەت و ڕێبازی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام ئەوەیە کە یەکەمین هەنگاوی دەست پێ کردنیان و بەردی بناغەی کارکردنیان بریتی بووە لە چەسپاندنی بیری خوا بەیەک زانین ( التوحید ) ، وەک خوای بەرزو مەزن و تاک و پاک لەوبارەوە فەرموویەتی :( وما أرسلنا مِنْ قبلک مِنْ رسول إلاّ نوحي إليه انه لا إلهَ إلاّ أنا فاعبدون ) الأنبياء / ٢٥.
( تێبینی : ئەم ئایەتە پێشتر تەرجەمە کراوە ) .

زانای ناودار ( أحمد الدهلوي ) لەوبارەوە فەرموویەتی: ( بێگومان پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام سەرەتای بانگەوازەکەیان و گەورەترین ئامانجیان لە هەموو ڕۆژگارێک دا و لە هەموو ژینگە " بیئة " یەک دا بریتی بووە لە ڕاستکردنەوەی بیروباوەر ( تصحیح العقیدة ) لەبارەی خوای بەرزەوە ، وە ڕاستکردنەوەی پەیوەندی نێوان بەندەو پەروەردگاری ، وە بانگەوازکردن بۆ ساغ کردنەوەی گەردن کەچی ( إخلاص الدین ) و یەکلاکردنەوەی خواپەرستی بە تەنێ بۆخوا ، وە ڕاگەیاندنی ئەوە کە بەس ئەو سوودو زیان گەیێن و ، شایستەی پەرستن و پاڕانەوەو پەنا پێ بردن و قوربانی بۆ سەربڕینە ، وە هێرشی پێغەمبەران و زەبری توندیان ئاراستەی ئەو بت پەرستی یە کرابوو کە لەسەردەمی وان دا لەئارادابووە ، کە بەشێوەیەکی زەق لە پەرستنی بت و صەنەم و ، پیاوچاکان دا ـ لە مردووان و زیندووان ـ خۆی دەنواند .... ) .[1]

---

(١) بڕوانە ( حجة الله البالغة ) ، وە بڕوانە ( النبوة والأنبياء ) محمد علي صابوني / ص ٣٧ ، ٣٨ .

بێگومان حیکمەت و فەلسەفەی ئەم جۆرە سیاسەت و شێوازەی پێغەمبەرانیش صلوات الله وسلامه علیهم ، ئەوە بووە کە بێ بڕوایی ( الألحاد ) و هاوبەش پەرستی ( الشرک ) ، بە واتایەکی دیکە ; خوانەناسین و بەهەڵە خواناسین مساک و بنەمای هەموو دەردو نەخۆشی بە فیکری و ئەخلاقی و سیاسی و کۆمەڵایەتی یەکانی ئینسانن و ، بەپێچەوانەوەش بەڕاستی ناسینی خوا کە لەپێش هەموو شتێک دا لە بە تاکزانیـــن ( توحید ) ی دا دەدرەوشێتەوە ، سەرچاوەی بەپێزی هەمــوو جۆرە چاکی و پاکی و خێرو خۆشی یەکی ماددی و مەعنەوی بە لە ژیانی تاک و کۆمەڵ دا ، چونکە خوا ــ جل جلاله ــ خاوەنی ئەوپەڕی چاکی و پاکی و جوانی و تەواوی یە ، بەڵکو ئــەم خەسڵەتە بەرزو پەسندانەو هەر خەسڵەتێکی دیکەی ئەوتــۆش بەشێوەیەکی زاتی و موتڵەق بەس لەخوادا هەن و ، ئینسانیش بە ئەندازەی نیزیکیی لەمەوە لەو خەسڵەتە بەرزو پەسندانە ــ بەئەندازەی ئامادەیی و لە سنووری سروشتی ئینسانانەیدا ــ بەهرەمەند دەبێت و ، بەپێچەوانەشەوە بێ بەش بوونـــــی ئینسان و دووری ی لە هەرچی سیفەتی چاک و پەسند هەیــە پەیوەندی یەکی ڕاستەوانە ( طردي ) هەیە لەگەڵ دوورەپەرێزیی لەخوای بەرزو مەزن ، هەربۆیەش خوا فەرموویەتی :( مَنْ كان يريد العزة فلله العزة جميعا .. ) فاطر / ١٠ . واتە : کێ شەڕەف و بەرزیی دەوێ ، ئەوە هەرچی شەڕەف و بەرزی ی هەیە ئی خودایە .. ( کەواتە : بەهۆی نیزیکی لەخـــواوە بەرزی و شەڕەفتان دەستگیر دەبێ ) .

وە دەربارەی ئەوانە کە خوایان لەبیردەچێتەوەو لێـــــی دووردەکەونەوە فەرموویەتی :( نَسُوا الله فنسيهم )التوبة /٦٧.

واته : خوایان فەرامۆش کردوە ، ئەویش ئیهمالی کردوون[1]

وە لە شوێنێکی دیکەدا فەرموویەتی : ( .. نسوا الله فأنساهم أنفسهم .. ) الحشر / ١٩ . واتە : خوایان لەبیر چۆتەوە ، ئەویش خۆیانی لەبیر بردوونەوە . ( واتە : لەسۆنگەی لەخوا دوورکەوتنەوەوە وایان لێ هاتوە ئاگایان لەخۆیان نەماوەو زیان و قازانجی خۆیان لێک ناکەنەوەو ، بەپێچەوانەی قازانج و بەرژەوەندی خۆیانەوە هەنگاو دەنێن بۆ ئەوەی هەست بەخۆیان بکەن ) .

چوارەم : یەکی دیکە لە ئیمتیازو تایبەتمەندی یەکانی خەت و ڕێبازی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام بریتیە لە ڕەچاو کردنی سادەیی و ساکاری و دووری لە ئاڵۆزی و شتی تویکڵدارو بەقۆرت و پێچ ، هەڵبەتە ئەم خەسڵەتەش درووشمو نیشانەیەکی یەکجار ڕوونی بانگەوازی گشت پێغەمبەرانە ، بەڵێ ئەو زاتە بەرزو بەڕێزانە لەگەڵ سروشت ( فطرة ) ی خەڵکی دا ڕۆیشتوون و لەقەدەر عەقڵیان دواندوویانن ، نەک وەک زۆربەی فەیلەسووف و سەرکردەکان کە شتی زۆر سادەو ڕوونیش لە خەڵکی ئاڵۆز دەکەن و ، بۆیان لە بەرگی جۆرا وجۆرەوە دەپێچن و لەجیاتی هیدایەتدان سەریان لێ دەشێوێنن ، بە هێنانەوەی یەک نموونەش لەوبارەوە کۆتایی بەم خاڵی چوارەمە دێنین :خوای قسەلەجێ فەرموویەتی :

( أَلَمْ تَرَ إِلى الذي حآجّ إبراهيم في ربّه أن آتاه الله المُلك ، إذ قال إبراهيم : ربي الذي يحي ويميت ، قال

---

(١) بۆیە لێرەدا وشەی ( نسیان ) بە ئیهمال کردن و پشتگوێ خستن تەفسیرکراوە ، چونکە ( لازم ) ی ( نسیان ) ە و ، ناشتوانین مەعنای ئەسڵی ( نسیان ) بۆخوا بەکاربێنین .

أنا أحي وأميت ، قال إبراهيم : فأن الله يأتي بالشمس مِنَ المشرق فأتِ بها مِنَ المغرب فبُهِتَ الذي كفر ... ) البقرة / ٢٥٨ . واته :

تەماشای ئەو کەسەت نەکردوە ـ بەچاوی عەقڵ و دڵ ـ کە لەگەڵ ئیبراهیم دا ـ علیه الصلاة والسلام ـ مشت و مڕی کرد لەبارەی پەروەردگاری یەوە ! لەسۆنگەی ئەوەوە کە خـــوا دەستەڵاتی دابۆیە ، کاتێک ئیبراهیم فەرمووی : پەروەردگارم ئەوەیە کە دەژیەنێ و دەمرێنێ ، ـ کابراکە توێژەرەوانــی قورئان و مێژووزانان دەڵێن ناوی نەمرووود بووە ـ گوتــی : منیش دەژیەنم و دەمرێنم ، (١) ئیبراهیم فەرمووی : دەجا ـ ئەگەر ڕاست دەکەی تۆش خوای ـ خوا هەمیشە ڕۆژێ لــــە ڕۆژهەڵاتەوە دێنێ ، تۆش ـ تەنانەت جارێک ـ لە ڕۆژئاواوە بیهێنە ! سەرەنجام ئەوەی بێ بڕوا مات و سەرسام بوو ..

پێنجەم : نیشانەو درووشمێکی دیکەی بانگەوازو ڕێبـــــازی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام ئەوەیە کە بەپێچەوانـــەی بیروباوەڕو بانگەوازەکانی دیکەوە خەڵکی بەرەو بەرنامەیەکی ئاشکراو ئامانجێکی ڕوون بانگ دەکەن کە هیچ جۆرە تـــەم و مژو تاریکی یەکی تێدا نابینرێ ، خوای بەرزو بێ وێنـــە لەوبارەوە فەرموویەتی :( قل هذه سبيلي أدعوا إلى اللـــه على بصيرة أنا ومَنِ اتبعني .. ) يوسف / ١٠٨ . واته : بڵێ : ئەمەیە ڕێبازی من : لەبەر ڕۆشنایی دا بەرەولای خوا بانگەواز دەکەین من و ئەوانەش کە شوێنم کەوتوون ..

---

(١) دەڵێن نەمرووود دوای ئەوەی ئەم قسەیەی کرد ، بابایەکـــی حوکمدراو بە مەرگی ، ئازاد کردو ، یەکێکی بێ خەتاشـــی کوشت !.

کەواتە : بانگەوازی خوایی یانەی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام هەم شێوازو چۆنیەتی یەکی سادەو سروشتی و بێ گرێ و قۆرتی هەیەو ، هەم ئەو ئامانج و مەبەستانەش کە خەڵکیان بۆلا بانگ دەکات شتی مەنتیقی و ڕوون و ئاشکراو خواڕسک ( فطري ) و بێ پێچ و پەنان ، بەڵام لێرەدا ڕاستی‌یەک هەیە ناکرێ لەئاقاری دا بێ دەنگ بین : ئێمە کە دەڵێین شێوازو چۆنیەتی و ئامانج و مەبەستی بانگەوازی پێغەمبەران ڕوون و ئاشکراو ساکارو سروشتی و بێ پێچ و پەنان ، مانای ئەوە نیە کە ئایین و بەرنامەی خوا لە قووڵی و وردەکاری بێ بەشە ، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە ئەو ئایین و بانگەوازە بەرزو پیرۆزو بەپێزە لەسۆنگەی ئەوەوە کە لەلایەن بەدیهێنەرو پەروەردگاری مرۆڤەوە هاتوە ، لە نیزیکترین ڕێگاوەو بە ئاسانترین شێوە دەچێتە نێو عەقڵ و دڵی ئینسانەوە ، ئەمە لەلایەکەوە ، لەلایەکی دیکەشەوە پێویستە بزانرێ کە سروشتی مرۆڤ بەئاسانی دەتوانێ هەق بناسێ و ، خستنەڕووی هەق حەوجێی بە وشەو تەعبیری چڕو هاڵۆزو بڵوز نیەو ، وەک ئافرەتی جوان و دڵگیروچاوو برۆ ڕەش حەوجێی بە بەرگ و پۆشاکی ئاڵ و والاو کل ( سورمە ) نیە ، بەڵام شتی ناڕاست و ( باطل ) وەک ئافرەتی دزێوو نالەپێش چاو[1] ، ناچارە بۆ شاردنەوەی ماهیەتی دزێوی خۆی پەنا بەرێتە بەر بەرگی زەرق و بەرق و زێڕو زەمبەر ، هەرچەندە ئەو خۆگۆڕینە ڕوالەتی بەش ، مەگەر لەبەرچاوی خەڵکی سادەو ڕواڵەت بین ، دەنا لەلای خەڵکی ژیرو وردبین هیچ دادی نادات و پێی هەڵناخەڵەتێن و دەزانن بایی چەندە !!

شەشەم : تایبەتمەندی یەکی دیکەی بانگەوازی پێغەمبەرانی خوا

---

(١) بێگومان جوانی ڕاستەقینە هیچ قەتماغە بەبێ جوانی مەعنەوی نییە کە لە بیروباوەڕی ڕاست و ڕەوشتی بەرزدا خۆی دەنوێنێ ، بەڵام لێرەدا بەس مەبەستم [illegible]

صلوات الله وسلامه عليهم ئەوەیە کە خەڵکی بانگ دەکات بۆ بەکەمگرتنی خۆشی و لەزەت و ناز و نیعمەتەکانی ژیانی دنیاو ، هەڵیان دەنێ بۆ زیاد لەپێویست سەرگەرم نەبوون بە ژیانی دنیاوەو ، قەناعەت کردن و بەشێوەیەکی سادە ژیان بەسەربردن ، چونکە ئەم ژیانە دنیاییە مەیدانی تاقیکرانەوەو کێڵگەی تێداچاندنە ، نەک تاقە هەل و دەرفەتی ڕەخساوی لەزەت وەرگرتن و ڕابواردن ، دەقی قورئان و سوننەتیش لەوبارەوە یەکجار زۆرن کە ئەمانە چەند نموونەیەکیانن :

أ ـ ( .. فما متاع الحياة الدنيا في الآخره إلاّ قليل .. ) . التوبة / ٣٨ . واتە : خۆشی و ڕابواردنی ژیانی دنیا لەچاو ـ ئی ـ دواڕۆژ بەس شتێکی کەمە ..

ب ـ ( يا أيها الناس إنّ وعدَ الله حق فلاتغرنكم الحياة الدنيا .. ) فاطر / ٥ . واتە : ئەی خەڵکینە ! بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە ، با ژیانی دنیا فریوتان نەدات ..

جـ ـ ( ما الدنيا في الآخره إلاّ مثل ما يجعل أحدكم أصبعه في اليمّ فلينظر بمَ يرجع ! ) رواه مسلم . واتە : دنیا لەچاو دواڕۆژ هەر وەک ئەوە وایە کە یەکێکتان پەنجەی دەخاتە دەریاوە ، جا با سەرنج بدات داخوا چی پێوە هاتوە !

لەکۆتاییدا دەڵێم :

بێگومان بەکەمگرتنی ڕابواردنی ژیانی دنیا پێویستە خەسڵەتێکی گرنگ و بنچینەیی هەموو مسوڵمانێک بێت کە خۆی بە شوێن کەوتووی پێغەمبەران دەزانێ و ، پابەندی بانگەوازو بەرنامەکەیان دەبێت ، بەڵام خەسڵەتی ناوبراو

پێویستە لە زانا و پێشەوایانی میراتگرو جێگری پێغەمبەراندا صلی اللە علیهم وسلم. شتێکی بنەڕەتی و بەرچاو بێت و، نابێ وەک خەڵکە سادەو عەوامەکان ڕەفتار بکەن، چونکە:

یەکەم: ئەو کەسانەی کە ئەوان خۆیان بە جێگرو میراتگریان دەزانن ئاوا بوون، دووەم: ئەوان بانگی خەڵک دەکەن بۆلای خواو بەرنامەکەی و، یەکێک لەو شتانەش کە بەرنامەی خوا فەرمانی پێ دەکات بریتیە لە بەکەمگرتنی ڕابواردنی ژیانی دنیاو، ماقووڵیش نیە بانگی خەڵک بکەن بۆ شتێک کە حاڵ و واقیعی خۆیان پێچەوانەیەتی، سێیەم: جێگرو میراتگری ڕەسەنی پێغەمبەران پێویستە وەک ئەو زاتە پایەبەرزانەی خۆی بە جێگریان دەزانێ لە ئێش و ژان و بەرماو گەرماو هەورازو نشێوی ژیانی خەڵکی دا بەشداربێت، جا بێگومان ئەگەر هەوڵ نەدات لە ژیانێکی بەقەناعەت و سادەو دنیا بەکەمگرانەدا بژیەت، مەگەر بە هەواڵ و دەنگ و باس ببیستێ، دەنا وەک پێویست لە حاڵ و بار و گوزەرانی خەڵکی تەنگدەست و نەدار ئاگادار نابێت.

هەوتەم: تایبەتمەندی یەکی دیکەی بانگەوازو ڕێبازی پێغەمبەرانی خوا صلی اللە علیهم وسلم ئەوەیە کە فراوان و هەمەلایەنەیەو، دەرو دەروون (ظاهر و باطن) ی ئینسان و سەرلەبەری بوارو لایەنەکانی ژیانی دەگرێتەوە، بەڵێ بەرنامەو پەیڕەوێک کە پێغەمبەرانی مەزن بانگەوازیان بۆ کردوە، هەم بەرنامەی تێگەیاندن و پێگەیاندنی تاک (فرد) بووە، لە بوارەکانی فیکری و ئەخلاقی داو، هەم بەرنامەی گۆڕین و چاککردن (التغییر والاصلاح) ی کۆمەڵگا (مجتمع) بووە، لە بوارەکانی ئابووری‌و سیاسی‌و

کۆمەڵایەتی و عەسکەری دا .(1)

هەشتەم : یەکی دیکە لەو تایبەتمەندی و درووشمانەی کە خەت و ڕێبازی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام لە خەت و ڕێبازەکانی دیکە جیادەکاتەوە ، ئەوەیە بەدرێژایی مێژوو بەزۆری خەڵکی نەدارو بەشخوراوو چەوساوەو ڕەش و رووت .. لایەنگرو پشتیوانی بووەو ئالاو مەشخەڵەکەی هەڵگرتووەو ، بەپێچەوانەوەش هەمیشە چینی مشەخۆری ستەمکارو خۆشگوزەرا نو چەوسێنەر پەرچ و لەمپەرو دوژمنی بابەکوشتەو سەرسەختی ئەو خەت و بەرنامەیە بووە ، هەڵبەتە هۆی ئەمەش ئاشکرایەو ئەم دیاردەیەش شتێکی زۆر سروشتی و چاوەڕوان کراو بووە ، چونکە بانگەوازو ڕێبازی پێغەمبەران دژی ستەم و چەوساندنەوەو بێ دادی و خۆسەپاندنەو ، وەک پێشتر گوتمان ئامانجی هەرەبەرزی بریتییە لە هێنانەدی و چەسپاندنی دادگەری ، دیارە ئایین و بەرنامەیەکی ئاواش لەسەرێکەوە خەڵکە ڕەش و رووتە چەوساوەو مافخوراوەکەی بە پشتیوانی خۆیانی دەزانن و وێڕای ئەمەش هیچ پەردەو دیوارێکیش لەنێوان ئەوان و ئەو ئایینەدا نییە وەک، ترسان لە تێکچوونی بەرژەوەندی ناشەرعی و خۆبەزلگری و.. هتد کە ڕێگای بڕواهێنانیان لێ بگرێ ، وە لەسەرێکی دیکەشەوە چینە خۆشگوزەران و چەوسێنەرو خۆبەزلگرەکە لە ئایین و ڕێبازی ناوبراودا گەورەترین مەترسی هەست پێ کردوە ، چونکە زانیویەتی ئەگەر بێت و سەربگرێ و بچەسپێ، هەژارو چەوساوەکان کۆت و زنجیری دەست و پێ یانیان

---

(1) لە ئاڵقەی شەشەمی ئەم زنجیرەیەدا بەناوی ( ئایین )ەوە تا ئەندازەیەکی چاک پێناسەی ئایین و بەرنامەی خوا کراوە .

دەپسێنن و كۆشكی ستەمو زۆرو بێدادی وانیش دەڕووخێنن ، بۆیە بەهەموو هێزو توانایانەوە كەوتوونە دژایەتیكردنی و جەنگێكی فراوانی ماددی و مەعنەوی ، یان جەستەیی‌و دەروونی ، یان ئابووری و سیاسی یان لەگەڵ دا بەرپاكردوە ، لەو بارەشەوە دەقی قورئان زۆرن ، بۆ نموونە :

أ ـ ( وما أرسلنا في قرية مِنْ نذير إلاّ قال مترفوها إنّا بما أُرسِلْتُم به كافرون ) سبأ / ٣٤ . واتە : وە هیچ ئاگادار ـ كەرەوە ( پێغەمبەر ) یكمان لە هیچ ئاوەدانی یەك دا نەناردوە مەگەر خۆشگوزەرانەكانی گوتوویانە ، ئێمە سەبارەت بەو ـ ئایین ـ ەی كە پێی ڕەوانەكراون بێ بڕواییین .

ب ـ ( ولقد أرسلنا نوحا إلى قومه ، إنّي لكم نذير مبين . أنْ لاتعبدوا إلاّ الله إنّي أخاف عليكم عذاب يوم أليم . فقال الملأ الذين كفروا مِنْ قومه مانراك إلاّ بشرا مثلنا ومانراك اتبعك إلاّ الذين هم أراذلنا .. ) هود / ٢٥،٢٦،٢٧ .

واتە : وە بێگومان نووحمان ناردەلای گەلەكەی ـ پێی گوتن ـ بێگومان من ئاگادار كەرەوەیەكی ئاشكرام بۆ ئێوە ، كە جگە لە خوا ـ هیچ شتێك ـ مەپەرستن ، من لە ئازاری ڕۆژێكی بەئێش لێتان دەترسم ، ئەو زلەزلانە كە بێ بڕوابوون لە گەلەكەی گوتیان : ئێمە بەس بە مرۆڤێكی وەك خۆمانت دەزانین ، وە ناشبینین كەست دواكەوتبێ جگە لەوانەی كە هەرچی‌و پەرچییەكانمانن .. ( دیارە چینی خۆشگوزەرانی چەوسێنەرو خوێنمژو خۆبەزلگر كە لەڕوانگەی خوارخێچی چەوسێنەرانەو خوانەناسانەی خۆیانەوە تەماشای شتان دەكەن چینی ڕەش‌و ڕووت‌و نەدارو چەوساوە هەر بە " أراذل " (١) لەقەڵەم دەدەن ) .

---

(١) (أراذل)كۆی(أرذل)ە ئەمیش (صيغة التفضيل)ی(رذيل)ە كە بەمانای پەستی‌و زەبوونی‌و كەم بایەخی دێت .

# ٧

# بۆچی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام خاوەنی موعجیزەبوون؟!

خوێنەری بەڕێز !

وەک لە باسەکانی ڕابردوودا باسکرا ، پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام بۆیە لەلایەن خواوە هەڵبژێرراون و ئەرکی بەرزو پیرۆزی پێغەمبەرایەتییان پێ سپێرراوە، تاکو ببنە موژدەدەرو ترسێنەرو ڕێ پیشاندەری خەڵکی بەرەو ڕاستە شەقامی خوا ، وە بۆیە نێرراون کە گۆڕان و چاککردن ( تغییر و إصلاح ) یێکی بنجی و هەمەلایەنەیی لە گشت بوارو لایەنەکانی ژیان دا بێننەدی و ، کۆمەڵگای نەفامی ( المجتمع الجاهلي ) و ڕژێمی طاغووتی لابەرن و بیگۆڕن بە کۆمەڵگایەکی مسوڵمان و حوکمێکی ئیسلامی .

ئنجا گومانیشی تێدا نیە کە ئەم کارە شتێکی یەکجار قورس و بەزەحمەتەو پێویستی بە ئامادەکردنێکی گرنگ و، چەندان پێداویستی ( مُستلزمات ) دەکات، کە یەکێک لەو پێداویستییانەو بەشێکی هەرە گرنگی ئەو ئامادەکردنە بریتیە لە هەبوونی بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراو بەهێز بۆ سەلماندن و پاڵپشت کردنی ڕاستیءو تەواویی ئەو بانگەوازو ڕێبازە نوێ و ناموۆ(ناباوە)ی کە ئەو پێغەمبەرانە هێناویانە .

دەجا ئەو بەڵگەو پشتیوانە لە زاراوی شەرع دا پێی دەگوترێ ( مُعْجِزَة ) وە ( بَيِّنَة ) وە ( آية ) ، کە لەمەعنا و

نێوەڕۆک دا لێک نیزیکن ، چونکە ( معجزة ) بەشتێک دەگوترێ کە ببێتە هۆی دەمکوت کردن و دەستەوستان کردنی خەڵکی ، وە ( بَیّنَة ) ش بە بەڵگەیەکی هێندە ڕوون و ئاشکراو بەهێز دەگوترێ کە هیچ کەس توانای ئینکاری کردن و ملەجیڕەی لەئاقاری دا نەبێ ، وە ( آیة ) یش بە درووشم و نیشانەیەکی وا دەگوترێ کە بشێ بکرێتە بەڵگەی ئیسپاتی بوون و ڕاستیی شتێک .

ئەمەش چەند دەقێکی قورئان لەوبارەوە :

أ- ( لقد أرسلنا رسلنا بالبینات .. ) الحدید /٢٥ . واتە: بێگومان ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان بە بەڵگەگەلی ئاشکراوە ڕەوانەکردوە ..

ب- ( وإلیٰ ثمود أخاهم صالحا قال یا قوم اعبدوا الله مالکم مِنْ إلهٍ غیره قد جاءتکم بیّنة مِنْ ربکم .. ) . الأعراف/ ٧٣ . واتە : وە بۆلای -گەلی- ( ثمود ) ساڵحی برایانمان نارد فەرمووی : ئەی گەلی خۆم خوا بپەرستن جگە لەوی چ خواتان نین ، بەتەئکیدیش لەلایەن پەروەردگارتانەوە بەڵگەیەکی ڕوونتان بۆهاتوە ..

ج- ( وإلیٰ مدین أخاهم شعیبا قال یا قوم اعبدوا الله مالکم مِنْ إلهٍ غیره ، قد جاءتکم بینة مِنْ ربکم ..) الأعراف/٨٥ . واتە : وە ناردمانە لای -گەلی- مەدیەن شوعەیبی برایان...

د- ( وقال موسى یا فرعون إني رسول مِنْ رب العالمین . حقیق علی أن لا أقول علی الله إلاّ الحق قد جئتکم ببینة مِنْ ربکم فارسل معي بني إسرائیل . قال إن کنتُ جئت بآیة فأتِ بها إن کنتَ مِنَ الصادقین ) الأعراف/ ١٠٤ ، ١٠٥ ، ١٠٦. واتە : وە مووسا فەرمووی : ئەی فیرعەون من پێغەمبەرم لەلایەن

پەروەردگاری جیهانەکانەوە . لە هەق گوتن بەولاوە لەمن ناوەشێتەوە کە بەناوی خواوە بیلێم ، بەتەئکید لە پەروەردگارتەوە بەڵگە ـ و موعجیزەی سەلماندنی ڕاستی خۆم ـ م بۆ هێناوی ، دەجا وەچەی ئیسرائیل (بني إسرائيل)م لەگەڵ بنێرە ! ـ فیرعەون ـ گوتی : ئەگەر هیچ نیشانەت هێناوە بیخەڕوو ، ئەگەر لە ڕاستانی ..

ئنجا شایانی باسە کە خوای کاربەجێ و زانا بۆ هەرکام لەو پێغەمبەرە پایەبەرزانە علیهم الصلاة والسلام جۆرە بەڵگەو موعجیزەو نیشانەیەکی تەرخان کردوە کە لەگەڵ جۆری ئەرکەکەی و بارودۆخی گەلەکەی و ئاستی فیکری یان دا بگونجێ ، بۆ وێنە : لەسۆنگەی ئەوەوە کە لە سەردەم و ڕۆژگاری ( مووسا ) دا علیه الصلاة والسلام زانیاری جادووگەری ی ( علم السحر ) باوبووە ، خوا جۆرە موعجیزەو بەڵگەیەکی داوە بە مووسا کە بەڕوالەت لە جادوو بچێ و بەرهەڵستی ئەو دیاردەیەی پێ بکات ، ئەویش بریتی بووە لە گۆچان ( عصا ) ەکەی و دەستی پیرۆزی ،
بەڵام چونکە لە ڕۆژگاری ( عیسی ) دا علیه الصلاة والسلام زانیاری پزیشکی ( علم الطب ) باوبووەو لەئارادا بووە ، خوا چەند موعجیزەو نیشانەیەکی وای بە عیسا بەخشی بوون کە بەڕوالەت لەشێوەی پزیشکی گەری دا بوون ، بەڵام لەڕاستی دا یاسادر ( خارق العادة ) بوون و ، لەڕێ ی زانیاری و تەجرەبەوە دەستگیر نەدەبوون و ئێستاش کە ( ۱۹۹۰ ) ساڵ بەسەر لەدایک بوونی ( عیسا )دا تێ دەپەڕێ هەر دەستگیر نەبوون و دەستگیریش نابن ، وەک :

مردوو زیندووکردنەوەو کوێری زگماک و باباى بەڵەک چاککردنەوەو لەقوڕ دروستکردنی باڵندەی زیندوو و .. هتد

ئەمە سەبارەت بە جۆرو چۆنیەتی موعجیزەکان ، بەڵام ئەو موعجیزانە لەلایەکی دیکەشەوە دیسان جیاوازی یان لەنێوان دا هەبووە ، کە بریتیە لە لایەنی ژمارەو چەندایەتی ، بۆ وێنە : پێغەمبەریکی وەک ( صالح ) علیه الصلاة والسلام لە قورئانیٚ دا بەس باسی حوشتر ( ناقة )ەکەی کراوە ، چونکە وادیارە ئەو پێغەمبەرە علیه الصلاة والسلام ئەوەندە بەڵگەیەی بەس بووە بۆ جێ بەجێ کردنی ئەرکەکەی و سەلماندنی دەعوایەکەی ، بەڵام دەبینین کەسانێکی وەک مووساو عیسا علیهما الصلاة والسلام هەریەکەی چەندان موعجیزەی جۆراوجۆریان [1] هەبوو ون ، لەبەرئەوەی ئەرکیان قورس ترو سنووری کارکردنیان فراوانتر بووەو حەوجێ یشان بە بەڵگەو نیشانەی زیاتر بووە .

ئنجا کە دەگەینە سەر باسی دوایین پێغەمبەرو گەورەترینیان ( محمد ) ی کوڕی ( عبدالله ) صلی الله علیه وآله وسلم ، دەبینین چەند جیاوازی یەک لەنێوان موعجیزەی - یان ڕاستر بلێین موعجیزەکانی - وی و ئی پێغەمبەرانی دیکەدا هەن :

یەکەم : موعجیزەی هەموو پێغەمبەرانی پێشوو تایبەت بووە بەو خەڵک و ڕۆژگارو بارودۆخەوە کە تێیان دا ژیاون و ، بە مردنی خۆیان موعجیزەکانیشیان نەماون ، بەڵام موعجیزەی

---

(1) بۆ وێنە : خوای بەرزو مەزن دەربارەی موعجیزەکانی مووسا علیه السلام فەرموویەتی :( ولقد آتینا موسی تسع آیات بینات .. ) الأسراء / ١٠١ .

پێغەمبەری سەردار علیه الصلاة والسلام ئەو سنوورە تەسكەی شكاندوەو هەر ماوەتەوە ، دیارە حیكمەت و هۆی ئەمەش ئەوەیە كە ئایین و بەرنامەی ئەو پێغەمبەرانە علیهم الصلاة والسلام تایبەت بووە بە كۆمەڵە خەڵكێكی دیاری كراوو رۆژگارێكی سنووردارەوەو ، لەدوای هەركام لەو بەرنامانە خوا پێغەمبەرو بەرنامەی دیكەی ناردوون ، بەڵام بەرنامەی پێغەمبەری كۆتایی ئایینێكی گشتی و هەمیشەیی خەڵكی سەرزەوی یەو ، جارێكی دیكەش هیچ بەرنامەو رێڕوونیەكی دیكە لەلایەن خواوە بەدوای وی دا نایەت ، كەواتە پێویستە هەم بەرنامەكە لە گۆران و لادان ( تغییر وتحریف ) بپارێزرێ و ، ( إنا نحن نزلنا الذكر وإنا له لحافظون ). الحجر / ٩ . ، وە هەم ئەو موعجیزەو بەڵگەیەش كە شایەدو پشتیوانیەتی بمێنێتەوەو بەسەرنەچێت !

دووەم : ئەگەر سەرنج بدەینە موعجیزەی پێغەمبەرانی پێشوو دەبینین هەموویان شتی یاسادر ( خارق العادة ) ی زەق و بەرچاو و بەرهەست ( محسوس ) بوو ون ، بەڵام موعجیزەی پێغەمبەری كۆتایی صلى الله علیه وآله وسلم موعجیزەیەكی فیكری و ئەدەبی و عیلمی یە !!

هەڵبەتە هەر خوا زانیاری راستەقینەی لەوبارەوەو لە هەموو بارێكی دیكەشەوە هەیە ، بەڵام رەنگە هۆو حیكمەتی ئەم دیاردەیەش ئەوە بێت ، كە پێغەمبەرانی پێشوو لەنێو گەلانێك دا هاتوو ون و لەچەند قۆناغێك دا نێرراون كە مرۆڤایەتی بەشێوەیەكی گشتی لە قۆناغی پێنەگەیشتنی فیكر ( مرحلة عدم النضج الفكري ) ی دابووە ، هەربۆیەش حەوجێی بەوەبووە كە زیاتر لەرێی پێنج هەستەكانی یەوە

بدوێنرێ و هەقی لە قالبی شتی بەرهەستدا بخرێتە بەرچاو، بەڵام دوای هاتنی دوایین پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام بە تەواوترین بەرنامەی خواوە مرۆڤایەتی لە قۆناغی کامڵ بوونی فیکر ( مرحلة الرشد الفكري ) نیزیک بووبووەو پێویست بوو پێغەمبەرێک و بەرنامەیەکی بۆ بنێرێ کە بەڵگەو موعجیزەیەکی گونجاو لەگەڵ ئاستی فیکریی خۆی پاڵپشتی بێت، دیارە ئەو بەڵگەو موعجیزەیەش قورئانە .

سێیەم : ئایین و بەرنامەی پێغەمبەرانی دیکە لە موعجیزەکانیان جیابوون ، بەڵام پێغەمبەری کۆتایی علیه الصلاة والسلام بەرنامەو موعجیزەکەی هەر یەکن ، واتە بەرنامەیەکی پێ دراوە کە لە عەینی بەرنامەبوونی دا موعجیزەشەو لە عەینی موعجیزەبوونیشی دا بەرنامەیە .

چوارەم : هەرچەندە قورئانی بەرێزو قسەلەجێ یەکەمین و گەورەترین بەڵگەو موعجیزەی ( محمد ) ە صلی الله علیه وآله وسلم بەڵام تاقە بەڵگەو موعجیزەی ئەو زاتە پایەبەرزە نیە ، بەڵکو بەڵگەو موعجیزە ئیسپاتکەرەکانی پێغەمبەری نەخوێندەوارو پەسندئاکار یەکجار زۆرن ، بە دەیان (1) دەژمێررێن ، بەڵام لەبەر دوو هۆیان کە باسی موعجیزەکانی ئەو زاتە دەکرێ ، بەس قورئان ناودەبرێ و کەمتر باسی موعجیزەکانی دیکەی دەکرێ :

---

(1) موعجیزەکانی پێغەمبەرمان علیه الصلاة والسلام لە زۆر سەرچاوان دا باسکراون و لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوە ، بەڵام بە بڕوای من چاکترینیان کتێبی ( الشفا ) ی ( قاضي عیاض ) ە ، کە لە چوار بەرگی قەبەدا چاپکراوەو دوو شەرحی ( علي القاري ) و ( خفاجي ) بەسەرەوەیە .

أ ـ چونکە زۆربەی هەرەزۆری موعجیزەکانی دیکەی بە کۆچکردنی نەماون و کۆتایی یان پێ هاتوە .

ب ـ چونکە ئەوەی کە خوا وەک بەڵگەو شایەدی سەلماندنی دەعوای پێغەمبەرایەتی بە ( محمد ) ی بەخشیوە بەس قورئان بووە ، وە ئەو بەڵگەو موعجیزانەی دیکەی زیاتر پێشانی هاوەڵانی بەڕێزی داوە بەمەبەستی زیاتر قەناعەت هێنان و بڕوادامەزران نەک بڕواهێنان !!

ڕەنگە هۆو حیکمەتی ئەمەش کە پێغەمبەری کۆتایی صلی اللە علیە وآلە وسلم بەس قورئانی وەک بەڵگەو نیشانەی ڕاستیی خۆی و بەرنامەکەی بەکارهێناوە ، ئەوەبێ کە دوایی شوێن کەوتووانی ویش لەکاتی خەبات و بانگەوازی دا هەست بە بێ بەڵگەیی و بێ هێزی نەکەن و نەڵێن : حەیفێ ئێمەش ویڕای قورئان فلان و فیسار یاسادڕیشمان لەدەست نایەت !! (1) بەڵکو هەست بکەن کە ئەوانیش وەک پێشەوای بەرزو بەڕێزیان پشتیان بە هەمان تاقە پاڵپشتی هەرە بەهێزەوە داوە کە کاتی خۆی ئەو کردوویەتە بەڵگەو شایەدی سەلماندنی ڕاستیی بانگەوازو ڕێبازەکەی !!

ئنجا شایانی باسیشە کە قورئانی بەپێز لەهەمان کاتدا کە بەڵگەو موعجیزەی دوایین پێغەمبەرە علیە الصلاة والسلام

---

(1) دیارە لە ئەنجامی شوێن کەوتنی ڕاست و ساغ و دڵسۆزانەی سونەتی پێغەمبەردا علیە الصلاة والسلام زۆرجاران بەفەرمانی خوا ( کرامە ) ی جۆراوجۆر لەسەر دەستی بەندە خواناس و ساڵحەکان دەردەکەون ، بەڵام هەروەک چۆن پێغەمبەرمان موعجیزەکانی خۆی ـ جگە لە قورئان ـ نەدەکردنە پاڵپشتی بانگەوازەکەی ، دۆستانی خوا ( أولیاء اللە ) ش ئەو ( کرامە ) و یاسادرانە ( خوارق العادات ) ی خۆیان بەمەبەستی بەڵگەهێنانەوەو پێ سەلماندن ناخەنەڕوو ، مەگەر لەچەند حاڵەتێکی کەم و ڕیزپەڕو لەکاتی ناچاری دا .

بەڵگەو شایەدی ڕاستیی پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەرانی پێشووشە ، چونکە چ بەدرێژی ( تفصیل ) ی - وەک موعجیزەی هەرکام لە ( إبراهیم و موسی و عیسی و صالح و داوود و سلیمان و یونس و زکریا .. ) - وە چ بەکورتی ( مجمل ) ی - وەک باسکردنی موعجیزەی پێغەمبەرانی دیکە کە هەموویان خاوەن بەڵگەو نیشانەی ئاشکرابوو ون - باسی ئەو بەڵگەو نیشانانەشی کردوە کە بە باقی پێغەمبەران دراون .

کۆتایی ئەم باسەش بەم فەرموودەیەی پێغەمبەر صلی الله علیه وآله وسلم دێنین کە دەفەرموێ :( ما مِنْ نَبيٍّ إلاّ وأوتي مِنَ الآيات ما مثله آمن عليه البشر ، وانما كان الذي أوتيته وحيا أُوحى إلي ، فأنا أرجوا أن أكون أكثرهم تابعا يوم القيامة ) .[1] رواه البخاري .

واتە : هیچ کەس لە پێغەمبەران نەبووە کە بەڵگەو نیشانەی وای نەدرابێ کە ئینسان بڕوایان پێ بهێنێ ، وە بێگومان ئەو - موعجیزە - ەی پێم دراوە وەحییێک بوو بۆم نێرراوە ، بۆیە من ئومێدم وایە کە لەڕۆژی دوایی دا لە هەموویان شوێن کەوتووم زیاتربن .



---

(١) بڕوانە ( العقيدة الأسلامية وأسسها ) نووسینی : عبدالرحمن حسن حبنكة الميداني / ص ٣٢٧ ، ٣٢٨ ، وە بڕوانە کتێبی ( الرسول ) ج ص نووسراوی ( سعيد حوّى ) ، وە ( شرح وتحليل الأصول العشرين للإمام الشهيد حسن البنا ) اعداد محمد عبدالحكيم خيّال صـ ١٨١ .

# ئایا لەنێوان پێغەمبەراندا بەرزی و نزمی هەیە؟!

لەوەڵام دا دەڵێین :

بەڵێ هەرچەندە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام هەموویان لە یەک سەرچاوەیان خواردۆتەوەو ، لە یەک کڵاورۆژنەوە تیشکی هیدایەت و ڕێڕوونی خوایان بۆ هاتۆتەخوار ، وە هەرچەندە پێغەمبەرانْ تێکڕایان و تاک تاکیان هەڵبژاردەی مرۆڤایەتی و شاگوڵی باغی کائیناتن و غەیری (۱) خۆیان هیچ کەس نەک هەر شانیان لە شانی نادات بەڵکو تۆزی ڕێگاشیان ناشکێنی و دەسکانیشیان لەدوا ناکات ، بەڵام وەک گوتراوە :( پەنجەی دەستانیش وەک یەک نین ) و ئەوانیش لەنێو خۆیان دا گەورەو گچکەیی و بەرزی و نزمییان هەیە ، دەقی قورئان و سوننەتیش لەوبارەوە زۆرن و یەکجار ئاشکراو بێ پێچ و پەناشن ، بۆ وێنە :

أ ـ ( تلک الرسل فضلنا بعضهم علی بعض .. ) البقرة / ٢٥٣ .

واتە : ئەو پێغەمبەرانە هەندێکیانمان بەسەر هەندێکیان دا هەڵبژاردوە ـ و بەچاکترمان داناون ـ .

---

(۱) لە هەندێک کتێبو سەرچاوەی مسوڵمانانی شیعەی دوازدە ئیمامی ( الشیعة الاثنا عشریة ) دا خوێندوومەتەوە کە ( علی بن أبی طالب ) خوا لێی ڕازی بێ بێجگە لە ( محمد ) صلی الله علیه وآله وسلم لە هەموو پێغەمبەرانی دیکە بەگەورەتر دەزانن !! دیارە ئەمەش جگە لە خەیاڵێکی پووچی بێ بەڵگە چیدی نیە .

ب ـ ( ولقدْ فضلنا بعض النبيين على بعض .. ) الاسْراء / ٥٥ .
واته : وه بێگومان هەندێک لە پێغەمبەرانمان بەسەر هەندێکیان دا هەڵبژاردوە ..
جـ ـ ( فاصبر كما صبر أُولوا العزم مِنَ الرسل .. ) الأحقاف /٣٥ .
واته : خۆڕاگره وەک چۆن خاوەن عەزمان لە پێغەمبەران خۆیان ڕاگرت ..
(( لەم ئایەتە دەفامرێتەوە کە پێغەمبەرانیش علیهم الصلاة والسلام هەندێکیان خاوەنی ئیرادەو عەزم و بڕوایەکی زۆر دامەزراوو پتەوو نەلەخشاو بووون کە بەهیچ شێوەیەک کول بوون و ( لەقین ) یان نەبووە ، بەڵام ئەوانی دیکەیان وانەبووون و لەو بوارەدا پلەیان نزمتر بووە ، تەنانەت هەندێکیان پلەی عەزم و ئیرادەو بەرهەڵستییان لەبەرانبەر کێشەو گیروگرفتان دا لەچاو ئی خاوەن عەزمەکان هێندە کەم بووە ، کە خوا بە ڕاشکاوی بەبێ عەزمی ناوبردوە ، یان بە پێغەمبەرمانی فەرمووە کە وەک وان نەبێت ،
( ولقد عهدنا إلى آدم مِنْ قبل فنسي ولم نجد له عزما .. )
طه / ١١٥ . ، ( .. ولاتكن كصاحب الحوت .. ) القلم / ٤٨ .
( کە مەبەستی لە " یونس " پێغەمبەرە علیه السلام ) . )) .
د ـ ( أنا سيد ولد آدم يوم القيامة ولافخر ، وبيدي لواء الحمد ولافخر ، وما مِنْ نبيٍ آدم فمن سواه إلاّ تحت لوائي ولافخر .. ) رواه الترمذي . واته :
ـ پێغەمبەرمان ( محمد ) عليه الصلاة والسلام فەرموویەتی ـ
من لە ڕۆژی دوایی دا گەورەی وەچەی ئادەمم وە بە شانازی کردن و خۆهەڵکێشانیشەوە وانالێم ـ بەڵکو مەبەستم ڕوونکردنەوەی هەق و واقیعە ـ وە ئاڵای سوپاس کردن ـ ی خوا ـ

بەدەستی منەوە دەبێ و شانازیش ناکەم ، وە هیچ پێغەمبەرێک نیە هەر لە ئادەمەوە هەتا ئی دوایە کە لەژێر ئالای – سەرکردایەتی – من دا نەبێ وە مەبەستیشم خۆهەڵکێشان نیە ..

هـ – ( أنا سید ولد آدم یوم القیامة ) رواه البخاري ومسلم وأبوداوود .

جا خوێنەری خۆشەویست !

لەبەرئەوەی لە خاڵی نۆیەمیش دا کە باسی ژمارەو جۆری پێغەمبەرانی خوای تێدا دەکەین ، زیاتر تیشک داوێینە سەر ئەم مەسەلەیە لێرەدا بەم ئەندازەیە وازی لێ دێنین ، بەڵام بەرلەوەی ئەم باسە بەجێ بێڵین بەپێویستی دەزانم وەڵامی پرسیارێک بدەینەوە :

یەکێک بۆی هەیە بپرسێ :

باشە چۆن دەتوانین بڵێین لەنێوان پێغەمبەران دا علیهم الصلاة والسلام بەرزی و نزمی هەیە لەحاڵێک دا کە خوای دادگەر لەسەر زمانی بەندە خواناس و موسوڵمانەکانی ، فەرموویەتی : ( .. لانفرق بین أحد منْ رسلە ..) البقرة/٢٨٥ .

واتە : جیاوازی ناخەینە نێوان هیچ کام لە پێغەمبەرانی – خوا – یەوە ؟!

لەوەڵام دا دەڵێین :

قورئان هەندێکی هەندێکی تەفسیر دەکات و لە سوورەتی ( النساء ) دا مەبەست و مەعنای وشەی ( نفرق )و چۆنیەتی ئەو ( جیاوازی دانان ) ە ڕوونکراوەتەوە ، وەک دەفەرموێ: ( إن الذین یکفرون باللە ورسلە ویریدون أن یفرقوا بین

الله ورسله ، ويقولون نؤمن ببعض ونكفر ببعض .. ) /١٥٠.
واته : بێگومان ئەوانەی بەرانبەر بەخواو بە پێغەمبەرانی بێ بڕوان ، وە دەیانەوێ جیاوازی بخەنە نێوان پێغەمبەرانی خواوە ، وە دەڵێن : بڕوا بەهەندێکیان دێنین و بڕوا بە هەندێکیان نایەنین ..

( لێرەدا بەئاشکرا دەبینرێ کە مەبەست لە وشەی ( یفرقوا ) جیاوازی خستنە نێوان پێغەمبەرانی خوایە صلی الله علیهم وسلم لەبواری بڕواپێ بوون و پێنەبوون دا ، نەک لەبواری هەڵبژاردن و بەچاکتر دانانی هەندێکیان بەسەر هەندێکیان دا کە لەچەند شوێنی دیکەدا ، خوا بۆخۆی وای فەرمووە ، وەک پێشتر باسکرا ) .

تێ بینی :
نیمچە ڕستەی ( إن الذین یکفرون بالله ورسله .. ) وەک زانایانی ڕێزمان ( علماء قواعد اللغة ) دەڵێن لە ( محل الرفع ) دایەو نیهاد ( مبتدأ ) ە ، گوزارە ( خبر ) ەکەشی نیمچە ڕستەی ( أولئک هم الکافرون حقا ) ە کە ئەویش لە ( محل الرفع ) دایەو ، لە ئایەتی ژمارە ( ١٥١ ) دا هاتوە .

٩

# ژمارەو جۆری پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام

خوێنەری بەڕێز !

لەوەتی یەکەمین ئینسان پێی ناوەتە سەر زەوی ، خوای میهرەبان خەڵکی سەر زەوی لە پێغەمبەرانی بەڕێزی و بەرنامەکانی خۆی بێ بەش نەکردوەو ، لەهەموو چاخ و سەردەمێک داو بۆ هەموو گەل و کۆمەڵێک پێغەمبەرێک یان زیاتری ناردوە ، لەوبارەوە ئایەتی قورئان زۆرن ، بۆ وێنە :

أ ـ ( .. وإن مِنْ أمةٍ إلاّ خَلا فيها نذير ) فاطر / ٢٤ . واتە : .. وە هیچ کۆمەڵێک نیە کە ئاگادارکەرەوەیەکی تێدا رانەبردبێ . ( لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئاگادارکردنەوەو ترساندن و ڕاچڵەکاندن تایبەتی ترین خەسڵەتی پێغەمبەرانە علیهم الصلاة والسلام ، لەزۆر جێی قورئانێ دا پێغەمبەران بە " نذیر " یان " منذر " ناوبراون ) .

ب ـ ( ولقد بعثنا في كُلّ أُمةٍ رسولا .. ) النحل / ٣٦ . واتە : وە بێگومان لەنێو هەموو کۆمەڵێک دا پێغەمبەرێکمان ناردوە..

ج ـ ( يا معشر الجن والأنس أَلَمْ يأْتِكُم رسلٌ منكم يَقُصّون عليكم آياتي ويُنذِرونكم لقاء يومِكُم هذا ؟ قالوا شهدنا على أنفسنا .. ) الأنعام / ١٣٠ . واتە :

ئەی کۆمەڵی جندو ئینسان ! ئەدی پێغەمبەرانێک لەخۆتان نەهاتنە لاتان کە ئایەتەکانی منیان بەسەردا دەخوێندنەوەو لە دیداری ئەم ڕۆژەتان ئاگاداریان دەکردنەوە ؟ گوتیان

شایەدی لەسەر خۆمان دەدەین .. ( کە پێغەمبەرانی خواو ترسێنەرو بێدارکەرەوەمان بۆ هاتوون .. ) .

بەڵێ بەدرێژایی مێژووی - وەک پێویست - نەزانراوی مرۆڤایەتی لەسەر خڕۆکەی زەوی ، خوای میهرەبان بەمەبەستی ڕێ پیشاندان و دەستگرتنی ئینسان بەرەولای خۆی و ژیانێکی ئینسانانەی وا کە ببێتە مایەی بەختەوەربوون و خێروخۆشی خۆی و ، ڕازی بوونی خوا ، پێغەمبەرانی زۆرو جۆراوجۆری ناردوون ، تاکو هەرکەسێک کە بیەوێ بەرەو ڕەزامەندی خواو ژیانێکی خوانانەی پڕ شادی و بەختەوەری‌و شەڕافەت - مەندانە ڕێ بگرێتەبەر ، چراو ڕووناکی و مەشخەڵێکی وای لەبەرچاوان هەبێت کە بەرپێ‌و دەوروبەری خۆی پێ ببینێ و ، لەبەر بێ دەلیلی و نەشارەزایی پەکی نەکەوێ‌و دۆش دانەمێنێ ، بەڵام ئایا ژمارەی ئەو زاتە بەرزو بێ وێنانە چەندەو چەند جۆر بوو ون ؟ ئەوە لێرەدا دەمانەوێ لەبەر تیشکی قورئان‌و سوننەتدا بیخەینەڕوو :

لەپێشەوە دەڵێین ، خوای زانا بەئاشکرا فەرموویەتی : ( ولقد أرسلنا رسلا مِنْ قبلک منهم مَنْ قصصنا علیک ومنهم مَنْ لَمْ نقصص علیک .. ) غافر / ٧٨ . واتە : وە بێگومان لەپێش تۆدا پێغەمبەرانێکمان ناردوون ، جیا هەیانە بۆمان باس - ی بەسەرهاتەکەیان - کردووی و هەشیانە بۆمان نەگێڕاویەوە ..

کەواتە بێجگە لەو پێغەمبەرانەی کە ناویان لە قورئانێدا هاتوەو بەسەرهاتی زۆربەشیان چ بەکورتی چ بەدرێـــژی گێڕراوەتەوە ، پێغەمبەرانێکی دیکەش هەبوو ون کە خـوا

لەقورئانیّ دا ناوی نەبردوون و بەسەرهاتەکانیشیانی نەگێڕاوەتەوە ، ئەو پێغەمبەرانەش کە لەقورئانیّدا ناویان هاتوە ( ٢٥ ) ن کە ئەمە ناوەکانیانن :
( آدم ، إدريس ، نوح ، إبراهيم ، إسماعيل ، إسحاق ، يعقوب ، داوود ، سليمان ، أيوب ، يوسف ، موسى ، هارون ، زكريا ، يحى ، يونس ، هود ، شعيب ، صالح ، لوط ، إلياس ، أليسع ، ذو الكفل ، عيسى ، محمد ) صلوات الله وسلامه عليهم .

وە لە فەرموودەی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم هاتوە کە ژمارەی تێکڕای پێغەمبەران ( ١٢٤٫٠٠٠ ) ە ، لەو ( ١٢٤٫٠٠٠ ) ە ، ( ٣١٥ ) یان پەیامبەر ( رسول)بوو ونو ، ئەوانی دیکەش بەس ( نبيّ ) بوو ون ، پێشتریش باسمان کرد کە جیاوازی نێوان ( رسول ) و ( نبي ) ئەوەیە کە هەرچی ( نبي ) یە بەس خۆی لەسەرەو هیچ پەیام و بەرنامە ـ یەکی بۆ غەیری خۆی پیّ نەسپێرراوە ، بەڵام ( رسول ) بابیەکە وێڕای خۆی دەبیّ پەیام و بانگەوازی خوا بەخەڵکی دیکەش ڕابگەیەنیّ ، کەواتە هەموو ( رسول ) ێک (نبيّ)یشە ، بەڵام مەرج نیبە هەموو ( نبيّ ) ێک ( رسول ) بێت ، ئەو فەرموودەیەش کە ئەو ژمارانەی تێدا باسکراون ئەمەیە :
( عن أبى ذر رضي الله عنه قال : يا رسول الله أي الأنبياء كان أول ؟ قال : آدم ، قلت : يا رسول الله ونبيّ كان ؟ قال : نعم " نبيّ مكلم " ، قلت : يا رسول الله كَمْ المرسلون ؟ قال : ثلاثمائة وبضعة عشر جمًا غفيرا ، وفي رواية عن أبي امامه ، قال أبوذر : قلت يا رسول الله كم وفاء عدة الأنبياء ؟ قال : مائة ألف وأربعة وعشرون

أُلفا ، الرسل مِنْ ذلك ثلاثمأئة وخمسة عشر جمّاً غفيراً ) .
رواه الأمام أحمد .(١)

ئنجا بەرلەوەی ئەم باسەش بەجێ بێڵین پێویستە هەروا بەکورتی ئاماژە بۆ دوو مەسەلەی دیکەش بکەین :
یەکەم : لەنێو ئەو (٣١٥) پێغەمبەرەدا کە هەڵبـــــــژاردەو پێشەوای باقی پێغەمبەرانن علیهم الصلاة والسلام پێنـــج کەسیان بە خاوەن عەزم و ئیرادەی پتەوو بەهێز ناسراون ، ئەوانیش بە بۆچوونی زۆربەی توێژەرەوانی قورئـــان و لێکۆڵەرەوان ئەمانەن : ( نوح ، إبراهیم ، موسی ، عیسی ، محمد ) علیهم الصلاة والسلام ، بۆیەش خوای دادگەر ئـــەم ناوو نیشان و شۆرەتەی بەو پێنجانە بەخشیوە ، چونکـــە هەرچەندە تێکڕای پێغەمبەران خاوەنی هەموو خەسڵەتێکـــی بەرزو پەسند بوو ون ، کە یەکێک لەو خەسڵەتە پەسندانەش خۆڕاگری و عەزم و ئیرادەی پتەوو بەتین و ( پۆڵابین ) ە ، بەڵام ئەو پێنجانەیان خەسڵەتی ناوبراویان لە هەمـــووان زیاتر تێدا درەوشاوەتەوەو ، لەهەمووان پتر توانیویانــە بەرهەڵستی کوفرو ستەم و فەساد بکەن و ، بەرەنگـــاری نەمروودو فیرعەون و ئەبوو جەهلەکانی سەردەمی خۆیـــان ببن و ، لەهەمووانیشیان زیاتر توانیویانە ئەقڵی خۆیـــان لە گۆڕین و چاککردن و بەرەوپێش بردنی مرۆڤایەتـــی دا بنوێنن ، لە دوو شوێنانیش دا لە قورئانێ دا ناوی ئـــەو

---

(١) بڕوانە ( مشکاة المصابیح ) فەرموودەی ژمارە (٥٧٣٧)، وە بڕوانە هەرکام لە ( العقیدة الأسلامیة وأسسها ) ص ٤١٥، وە ( النبوة والأنبیاء ) محمد علي صابوني / ص ١٤ .

پێنج پێغەمبەرە مەزنە پێکەوە باسکراوە ، بەم شێوەیە :

١- ( وإذ أخذنا مِنَ النَبيِّين ميثاقهم ومنكَ ومِنْ نوح وإبراهيم وموسى وعيسى ابن مريم .. ) الأحزاب / ٧ .

٢- ( شرع لكم مِنَ الدين ما وصّىٰ به نوحا والذي أوحينا إليك وما وصينا به إبراهيم وموسى وعيسى .. ) الشورى / ١٣ .

وە شایانی باسە کە لەسەر ڕای زۆربەی زانایان ئەم پێنج پێغەمبەرە علیهم الصلاة والسلام پێشەوا و سەرکردەی تاقە پێغەمبەرانی خاوەن پەیڕەوو بەرنامەی سەربەخۆ ( مستقل ) شن . (١)

دووەم : هەروەک چۆن لەنێو ( ١٢٤,٠٠٠ ) پێغەمبەرەکەدا (٣١٥)یان لەهەموویان پایەبەرزترن ، وە (٥) یش لەنێو ئەو(٣١٥)یەدا بە خاوەن عَزم ( أولوا العزم ) ناسراون ولەوانی دیکە مەزنترن ، لەو پێنجانەش یەکێکیان کە ( محمد )ە ، صلى الله علیه وسلم گەورەترینیانەو ، پێشەوا و سەروەری سەرلەبەریانە ، وەک لە خاڵی پێشووشدا باسمان کرد ، بەڵێ هەروەک چۆن قورئانی بەڕێزو پڕ پیت و پێز کە کۆتایی بەرنامەکانی خوای پێ هێنراوە گەورەترین و بەرزترینیانە ، ( محمد ) یش صلى الله علیه وآله وسلم کە دوایین خشتێکە کۆشکی بیری خوابەیەکزانین و پێغەمبەرایەتی ( نبوة ) ی پێ تەواوکراوە ، تەواوترین و مەزنترینیانە ، خودا لەوبارەوە کە ( محمد ) علیه الصلاة والسلام کۆتایی

---

(١) بڕوانە ( مختصر تفسير الطبري ) ص ٥٧٥ . ط /دار الشروق هەروەها بڕوانە تەفسیری ( نمونه ) - فارسي - ج ٢٠ ، ص ٣٧٩ ، ناصر مكارم شيرازي .

پێغەمبەرانە فەرموویەتی :( ماكان محمد أبا أحدٍ مِنْ رِجالِكم ولكن رسول الله وخاتم النبيين .. ) الأحزاب / ٤٠ . واتە : موحەممەد ـ صلی الله علیه وآله وسلم ـ بابی هیچ کام لە پیاوانتان نیە ، بەڵکو پەیامبەری خواو کۆتایی پێغەمبەرانە ..

کۆتایی ئەم باسەش بەم فەرموودەیەی پێغەمبەر دێنین کە دەفەرموێ :

( مثلي ومثل الأنبياء مِنْ قبلي كمثل رجل بَنى بُنيانا فأحسنه وأجمله إلاّ موضع لَبِنَةٍ مِنْ زاويةٍ مِنْ زواياه ، فجعل الناس يطوفون به يعجبون له ويقولون هلاّ وضعت هذه اللَّبِنَةُ ! فأنا اللَّبِنَةُ وأنا خاتم النبيينَ ) متفق عليه .

واتە :

وێنەی من و وێنەی پێغەمبەرانی پێش من وەک ئەوە وایە کابرایەک خانوویێکی دروست کردبێ ، رێکی خستبێ و رازاندبێیەوە بێجگە لە جێی ( خشت ) ێک لە گۆشەیەک لە گۆشەکانی دا ، ئنجا خەڵکی بەدەوری دا بگەرێن و پێی سەرسام بن و بڵێن : بریا ئەم خشتەش رۆنرابا ! دەجا من ئەو خشتەیەم ; وە من کۆتایی پێغەمبەرانم .

# بانگەوازی پێغەمبەران لە ئەسڵدا یەکە و شێوەکانی جیاجیان

لەسۆنگەی ئەوەوە کە مرۆڤایەتی بەپێی ویستی خـــــودا لەشێوەی چەند گەل و هۆزی جیاجیادا بەسەر ناوچەکانـــــی زەوی دا دابەش بوو ون و ، لە هەموو گۆشەو کەنارەکانـــی دنیادا نیشتەجێ بوو ون ، ئەو ئایین و بەرنامانەش کە بە پێغەمبەرانی زۆرو جۆرا وجۆری خوادا بۆ ئەو خەڵکە پـــرژو بڵاوو جۆرا وجۆرە نێرراون ، هەرچەندە لە کاکڵ و نێوەڕۆک دا یەک بوو ون و خاوەنی یەک ئەسڵ و بنەڕەتن ، بەڵام لەشێوەو چۆنیەتی جۆرا وجۆردا خراونەڕوو ، دەقی قورئانیش دەربارەی هەرکام لەم دوو[1] دیاردەیە زۆرن کە بۆ وێنە هەندێکیان لێ دەخەینەڕوو :

یەکەم : دیاردەی یەکیەتی ئایین و بەرنامەی پێغەمبەران لە ئەسڵ و نێوەڕۆک دا :

أ ــ ( شرع لكم مِنَ الدين ما وصّى به نوحاً والذي أوحينا إليك وما وصينا به إبراهيم وموسى وعيسى أن أقيموا الديـــــن ولاتتفرقوا فيه .. ) الشورى / ١٣ . واتە :

ئەو ئایینەی کە بۆ ئێوەی کردۆتە بەرنامە هەمان شتە کە نووحی پێ ڕاسپاردبوو ، وە ئەوەیە کە بۆتۆمان ناردووە ،

---

(١) مەبەست دیاردەی یەکیەتی ئایین و بەرنامەی پێغەمبەرانە عليهم الصلاة والسلام لە ڕیشەو نێوەڕۆک داو جیاجیایـــــی ( تعدد ) یەتی لە شێوەو چۆنیەتی ڕواڵەتی دا .

ئەوەیە کە ئیبراهیم و مووساو عیسامان پێ ڕاسپاردبوون ، کە ئایین بەرپێوەبەرن و تێیدا پەرتەوازە مەبن ..

ب ـ ( وما أرسلنا مِنْ قبلِك مِنْ رسولٍ إلاّ نوحي إليه أنه لا إلهَ إلاّ أنا فاعبدون ) الأنبياء / ٢٥ .

( ئەم ئایەتە پێشتر مەعنا کراوە ) .

ج ـ ( ولقد بعثنا في كل أمة رسولا أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت .. ) النحل / ٣٦ . واتە :

وە بەتەئکید لە هەموو کۆمەڵێکدا پێغەمبەرێکمان ناردوە کە خوا بپەرستن و لە طاغووت دوورەپەرێزبن ..

بەڵێ خوێنەری خۆشەویست !

ئەسڵ و بنچینەو کاکڵ و نێوەڕۆکی بانگەوازو بەرنامە بەرواڵەت جیاجیاکانی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام بریتی بووە لە خواناسین و خوابەیەکزانین و ڕوولەخواکردن لە هەموو بوارو لایەنەکانی تاکی و کۆمەڵایەتی ژیاندا و ، دوورەپەرێزی و خۆپاراستن لە کەوتنە تەڵەو داوی طاغووتە زۆرو جۆراوجۆرەکانەوە .

دووەم : دیاردەی جیاجیایی بەرنامەکانی پێغەمبەران لە شێوەو ڕواڵەتدا :

أ ـ ( لِكلٍّ جعلنا منكم شِرعةً ومنهاجاً .. ) المائدة / ٤٨ .

واتە : بۆ هەرکامێکتان ـ مەبەست ئوممەتەکانە ـ بەرنامەو پەیڕەوێکی تایبەتیمان داناوە ..

ب ـ ( وما أرسلنا مِنْ رسول إلاّ بلسان قومه لِيُبيِّنَ لهم .. ) إبراهيم / ٤ . واتە :

وە هیچ پێغەمبەرێکمان بەزمانی گەلەکەی نەبێ نەناردوە ،

تاكو بۆيان ڕوون بكاتەوە .. ( كەواتە : ئەو زمانانەى كە كتێب و بەرنامەكانى خوايان پێ نێرراون و ، ئەو زمانانەى كە پێغەمبەران پێيان لەگەڵ گەلەكانيان دا دواون جياجيا بوون ) .

جـ ـ ( ثم جعلناك على شريعة من الأمر .. ) الجاثية / ١٨ .
واتە : ئنجا تۆمان خستە سەر بەرنامەيەك لە ـ شێوەو بەرنامەكانى ـ ئايين ..
كەواتە :

هەرچەندە ئايين و بانگەوازى پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام لە ئەسڵ و بنچينەدا يەكەو خەڵكى بەرەو يەك هەوارو مەنزڵ دەبات و ، بۆ يەك ئامانج و مەبەست بانگيان دەكات ، بەڵام بە جۆرو چۆنيەتى جياجيا و لە قاڵب و شێوەى جۆراوجۆردا ، ڕەنگە هۆو حيكمەتى ئەمەش ئەوەبێ كە ژيان و گوزەرانى ئينسان بەردەوام لە گۆڕان و پەرەستاندن دايەو ، ديسان تيرەو گەلەكانيش بەحوكمى جياوازى ناوچەو جياوازى ى ڕەنگ و زمان و داب و نەريت و جۆرى گوزەران و پەيوەندى يەكانيان و ئاستى فيكرىيان حەوجێيان بە بەرنامەو پەيڕەوى شێوە جياجيا و جۆراوجۆر دەكات ، هەربۆيەش دەبينين پێغەمبەرانى بەڕێزو پايەبەرز عليهم الصلاة والسلام هەتا باسى بيروباوەڕو تێڕوانين بۆ گەل و كۆمەڵەكانيان دەكەن لە يەك نوختەى هاوبەشەوە دەست پێدەكەن و پێداگيرى لەسەر چەند مەبەستێكى ديارى كراو دەكەن و ، زۆر جاران هەر شێوەى دەربڕينەكانيشيان دەقاودەق وەك يەكە ، بەڵام كە دێنەسەر باسى لايەنى بەرنامەيى ( الجانب التشريعي ) ، ئەوە هەم ئەو بابەت

( موضوع ) انەی کە لەبارەیانەوە دەدوێن و هەم شـێوەی تەعبیرەکانیشیان جیاوازی هەیە ، دیارە هۆی ئەمەش ئەوەیە کە هەرچی بیروباوەڕو تێڕوانین ( العقیدة والتصور ) ە لەسەر چەند ئەسڵ و بنەمایەک ڕادەوەستێ کە بریتین لە چەند ڕاستی ( حقایق ) یەکی چەسپاوو نەگۆڕ ، بەڵام هەرچی لایەنی بەرنامەو پەیڕەوە ئەوە پەیوەندی بە ژیـــان و گوزەران و جۆرو چۆنیەتی هەڵس و کەوت و پەیوەندی یەکانی خەڵکیەوە هەیە ، دیارە ئەم مەسەلانەش لە گـــۆڕان و پەرەستاندن و گەشەکردنێکی بەردەوام دان .

ئەمەش چەند نموونەیەک لە دەقەکانی قوڕئان سەبارەت بە خستنەڕووی هەرکام لە لایەنەکانی بیروباوەڕو بەرنامە لەسەر زمانی پێغەمبەران بۆ گەلەکانیان :

<u>یەکەم</u> : لایەنی بیروباوەڕ :

أ ـ ( لقد أرسلنا نوحا إلى قومه فقال يا قوم اعبدوا الله ما لكم مِنْ إله غيره إني أخاف عليكم عذاب يوم عظيم ) . الأعراف / ٥٩ .

ب ـ ( وإلى عاد أخاهم هودا قال يا قوم اعبدوا الله ما لكم مِنْ إله غيره أفلا تتقون ؟ ) الأعراف / ٦٥ .

جـ ـ ( وإلى ثمود أخاهم صالحا قال يا قوم اعبدوا الله ما لكم مِنْ إله غيره قد جاءتكم بينة مِنْ ربكم .. ) الأعراف / ٧٣ .

د ـ ( وإلى مدين أخاهم شعيبا قال يا قوم اعبدوا الله ما لكم مِنْ إله غيره قد جاءتكم بينة مِنْ ربكم .. ) الأعراف / ٨٥ .

وەک دەبینین لەبواری ڕاگەیاندنی بیروباوەڕدا دەنگـی زوڵاڵی پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام پەردەی کـــات و

شوێن ( زمان و مكان ) دەدرێ و بەهەموویان ( كۆرِس ) یەك
پیێك دێنن - بەڵام بەچەند زمانی جیاجیا - سروودی :
( اعبدوا الله مالكم مِنْ إله غیره ) دەڵێن !

با ئەمجار سەرنجی لایەنی بەرنامەیی بدەین :

دووەم : لایەنی بەرنامەیی :
أ- ( كذبت قوم نوح المرسلین . إذ قال لهم أخوهم نوح ألا تتقون . إني لكم رسول أمین . فاتقوا الله واطیعون . وما أسألكم مِنْ أجر إنْ أجريَ إلاّ على رب العالمین . فاتقوا الله وأطیعون . قالوا أنؤمن لك واتبعك الأرذلون ؟ قال وما علمي بما كانوا یعملون . إنْ حسابهم إلاّ على ربي لو تشعرون . وما أنا بطارد المؤمنین ) الشعراء /١٠٥-١١٤.
ب- ( كذبت عاد المرسلین . إذ قال لهم أخوهم هود ألا تتقون ؟ .... أتبنون بكل ریع آیةً تعبثون ؟ وتتخذون مصانع لعلكم تخلدون ؟ وإذا بطشتم بطشتم جبارین ؟ ) . الشعراء / ١٢٣ - ١٣٠ .
ج- ( كذبت ثمود المرسلین . إذ قال لهم أخوهم صالح ألا تتقون ؟ .... أتتركون فیما هُهُنا آمنین ؟ في جنات، وعیون ؟ وزروع ونخل طلعها هضیم ؟ وتنحتون مِنْ الجبال بیوتا فارهین ؟ فاتقوا الله وأطیعون . ولاتطیعوا أمر المسرفین . الذین یفسدون في الأرض ولایصلحون ) . الشعراء / ١٤١ - ١٥٢ .
د- ( كذبت قوم لوط المرسلین . إذ قال لهم أخوهم لوط ألا تتقون ؟ .... أتأتون الذكران مِنَ العالمین ؟ وتذرون ما خلق لكم ربكم مِنْ أزواجكم بل أنتم قوم عادون .. ) . الشعراء / ١٦٠ - ١٦٦ .

هـ ـ ( كذب أصحاب لئيكة المرسلين . إذ قال لهم شعيب ألا تتقون ؟ .... أوفوا الكيل ولاتكونوا مِنَ المخسرين . وزنوا بالقسطاس المستقيم . ولاتبخسوا الناس أشياءهم ولاتعثوا في الأرض مفسدين .. ) الشعراء / ١٧٦ ـ ١٨٣ .

وەک دەبینین بەرنامەو پەیرەوی گۆڕانکاری هەرکام لەم پێنج پیغەمبەرانە ( نوح ، هود ، صالح ، لوط ، شعیب )، صلی الله علیهم وسلم هەرچەندە تێکرا لەسەر یەک ئەسڵ و بنچینە دامەزراون کە بریتیە لە (( پارێزکاری بۆ خواو فەرمانبەری بۆ پێغەمبەر )) ( فاتقوا الله وأطیعون ) ، وە هەرچەندە نێوەڕۆک و مەبەستی هەمووانیشیان یەک شتە ، کە بریتیە لە گۆڕین و چاککردنی کۆمەڵ ، بەڵام هەرکامێکیان شێوەو ببچمێکی تایبەتی هەیەو مۆرکێکی سەربەخۆی پێوەیە ، ئەمەش لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئەو کۆمەڵگایانەی کە ئەو پێغەمبەرانە علیهم الصلاة والسلام لەگەڵیان ڕووبەڕوو بوون و لە چاککردن و گۆڕینیان وەخۆکەوتوون ، لێک جیاو جۆراوجۆر بوون و ، هەرکامێکیان لە بارودۆخو کات و شوێنێکی جیا لەوانی دیکەدا بووەو ، بە جۆرە نەخۆشی و گیروگرفتێکی تایبەتی یەوە گیرۆدە بووە ، کە ئەگەر لە هەندێک خاڵانیشدا پێک بگەنەوە ، بەشێوەیەکی گشتی هەر لێک جودان و، شێوەو چۆنیەتی‌یەکی سەربەخۆیان هەیەو، لەئەنجامی ئەمەشدا حەوجێیان بە شێوازو چۆنیەتی یەکی تایبەت و بەرنامەیەکی سەربەخۆش دەکات بۆ گۆڕین و چارەسەر .

با بزانین چۆن ؟!

یەکەمی ئەو پێغەمبەرانە کە ( نووح ) ە لەگەڵ گەل و کۆمەڵێک دا دەستەویەخە بووە ، کە ڕژێمی چینایەتـــی و چەوساندنەوەی ئابووری و سیاسی بەسەری دا زاڵ بـــووەو خەڵکەکە بۆتە دوو بەش ، زۆربەیەکی ڕەش و ڕووت و نـەدارو چەوساوەو مافخوراو کە زلەزلە چەوسێنەرو خۆشگوزەرانەکان بە ( الأرذلون ) یان[1] ناودەبەن ! ، بەڵام قورئان بەزۆری بە چەوسێنراوەکان ( المستضعفین ) [2] ناویان دەبات ، وە بەشی دووەمی کۆمەڵگای نووح دەستەیەکی کەمی خۆبەزلگرو خۆشگوزەران و چەوسێنەرەوەن ، کە لەزۆر جێی قورئانیێ دا بە زلەزلان ( الملأ ) و بە خۆبەزلگران ( المستکبرون )و بە خۆشگوزەرانان ( المترفون ) و بە زیادەڕۆکەران(المسرفون) ناویان دەبات ، جا لێرەدا نووح علیه السلام کە لەگـــەڵ کۆمەڵگایەکی ئاوادا ڕووبەڕوو بووە کە دووچـــاری دەردی چینایەتی و قڕی و پڕی و ڕژێمی ئاغاو مسکێنی بـــووە ، دەبینین بەزۆری تەئکید لەسەر ئەوە دەکات ـ دوای پاریزکاری خواو فەرمانبەری پێغەمبەر کە بنچینەی گۆڕین و چاککردنـی کۆمەڵگان ـ کە بابە سەنگی مەحەک و تەرازووی گرانـــی و سووکیی بڕیتیە لە کردەوە ( وما علمي بما کانوا یعملون) ،

---

(١) پێشتر وشەی (الأراذل ـ الأرذلون ) مان تەفسیر کـرد ، هەڵبەتە ( أراذل ) و ( أرذلون ) هەردووکیان هەر کـۆی ( أرذل ) ن ، ئەوەندە هەیە یەکەمیان ( جمع التکسیر ) ەو ئەوی دیکەیان ( جمع المذکر السالم ) ە .

(٢) لە وشەی ( المستضعف ) ەوە دەفامرێتەوە کە خەڵکـــە چەوسێنراوەکە لەزاتی خۆی دا بێ هێز ( ضعیف ) نیە ، بەڵکو بەئانقەست بێ هێز کراوە ، چونکە ( س ) ی ســــەر ( مستضعف ) سینی ( طلب ) ە .

وه که لەدوای کردەوەی چاک سەرەنجامی چاکیی و خراپیی بەندەکان بەس خوا دەیزانێ (إن حسابهم إلاّ على ربّي ..) کەواتە :

ئەوەی کە ئێوە ـ ئەی چینی خۆبەزلگرو چەوسێنەر ـ خۆتانی پێوە هەڵدەکێشن و شانازی پێوە دەکەن لە دەسەڵات و سامان و ڕەنگ و دیمەنی جوان و بنەماڵەو وەچاخ و ڕەچەڵەک ، هیچیان لەلای خوا بە سەنگی مەحەک و پێوەری هەڵسەنگاندن دانانرێن ، بەڵکو پێوەرو سەنگی مەحەکی ناسینی چاکیی و خراپیی ئینسانەکان بەس کردەوەی چاکە !!

دووەمیشیان کە ( هوود ) ە عليه السلام بۆ کۆمەڵگایەک نێرراوە کە ئامانج و مەبەستی هەرەبەرزی ژیان لەلای وان بریتیە لە دروستکردنی گردو قەڵای بەرز بەرزو کۆشک و باڵەخانەی بڵیندو بێرەزا لەسەر شوێنە بەرزەکان و ڕێ و بانان ، بەس بەمەبەستی کات بەسەربردن و ڕابواردنی بێ ئامانج و ڕێگری و دەستوەشاندن و فیزو کەشخەکردن بەسەر خەڵکی چەوساوەو بەشخوراودا ، بۆیە ئەویش لەوبارەوە ئامۆژگاری گەلەکەی دەکات و تێیان دەگەیەنێ ، کە ئەو جۆرە ڕەفتارانە پێچەوانەی ژیانێکی ئینسانانەن و لەگەڵ سوپاس و شوکرانە بژێریشدا بەرا وەژوون و پێویستە شەرم لە خوا بکەن و دەستیان لێ هەڵگرن !

سێیەمیشیان کە ( صالح ) ە عليه السلام بۆ گۆڕین و چارەسەری واقیعی دوور لە خوایانەی کۆمەڵێک نێرراوە کە لە ژیانێکی پڕ هێمنی و ئاسایش و بەزەرق و بەرق و پێشکەوتووی بەرزو ( ڕاقي ) دا سەرگەرمی ڕابواردن و گوزەران بوو ون کە باغ و باغات و کانی و سەرچاوەی زۆرو

کشت وکاڵ و دارخورمای میوە پێگەیشتوو و خانوو و کۆشکی لە شاخ داتاشراوو نەخش و نیگار تێداکێشراو چەند دیمەنێکی زەقی ئەو ژیانە ماددی یە پڕعەیش و نۆش و بەکەیف و سەفایە بوو ون ، بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کە کۆمەڵگای ( ثمود ) لەسەر بنچینەی پارێزکاری و پابەندی ی بە فەرمانی پێغەمبەرەوە دانەمەزراوە ، شان بەشانی ئەو پێشکەوتنە ڕواڵەتی یە ماددی یەو، ئەو ڕابواردن و گوزەرانە جەستەیی یە ، لەلایەن دەستەیەکی دیکتاتۆرو بەزەبرو زۆری خۆشگوزەران و زیادەڕۆکەر ( مُسْرِفْ ) ەوە کە کارو پیشەیان خراپەکاری ی ( إفساد ) و ئاشووبگێڕانە ، چەندان نەخۆشی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری پەرەیان گرتوەو ، ئەو عەیش و نۆش و ڕابواردنە ماددی یەیان کردۆتە ژارەمارو ژەقنەمووت ، بۆیە ( صالح ) لەو ڕووەوە گەلەکەی دەدوێنێو هەوڵ دەدات لە خەوی قورسی ژیانی ئاژەڵی ی وەخەبەریان بێنێ و ، ئەو دەستە خۆبەزلگرە خۆشگوزەران و خراپەکارە کە شیرازەی کۆمەڵگایان پچڕاندوەو هەموو شتێکیان لەگرێژەنە بردوە ، بە خەڵکە عەوام و سادەو فریوخواردوە مافخوراوەکە بناسێنێ !

( لووط ) یش کە چوارەمیانە لەسۆنگەی ئەوەوە کە کۆمەڵەکەی دووچاری نەخۆشی یەکی یەکجار نزم و پیسی ئەخلاقی بووە ، کە بریتیە لە نێربازی ، ئەویش وەک هاوەڵانی دیکەی دوای بانگەوازکردنی بۆ پارێزکاری و فەرمانبەری ( التقوی والطاعة ) بێ پێچ و پەنا بە خەڵکە سەرلێشیواوو ڕەوشت نزمەکەی ڕادەگەیەنێ کە ئەو کارە شتێکی یەکجار دزێوو پەست و نزمەو، خوا ئافرەتی بۆ پیاوو

پیاوی بۆ ئافرەت خولقاندوە ، نەک بەپێچەوانەوە ، وە پێیان ڕادەگەیەنێ کە ( أنتم قوم عادون ) ئێوە گەلێکی یاخی و لەڕێ دەرچوو و سەرکێشن !!

( شوعەیب ) یش کە بۆ چاککردن و گۆڕینی واقیعی بێ سەرەوبەرەو پەشێوی خەڵکی ( مەدیەن ) – کە بە خاوەن درەختەکە " أصحاب لئَيْكَة " ش ناسراون – نێرراوە ، لەبەر ئەوەی کۆمەڵی ناوبراو لەبواری ئابووری و مامەڵەو بازرگانی دا تووشی تەرازووبازی و فێڵ و فەرەج و ئۆیەن و سەگیەتیی بوو ون و ، لەئەنجامی ئەمەش دا بوو ونە خراپەکاران ( مُفسدين ) ی سەرزەوی ، زۆربەی ئامۆژگاری و ئاگاداری یەکانی لەو سوورگەیەدا دەسووڕێنەوە .

ئێستاش بەپێویستی دەزانم بەرلەوەی ئەم باسە بەجێ بێڵم سەرنجی خوێنەر بۆ مەسەلەیەکی گرنگ ڕابکێشم :

وەک لە سەرگوزشتەی ئەو پێنج پێغەمبەرە بەرزو بەڕێزەدا دەبینین هەرچەندە هەرکامێکیان لەبواری بەرنامەیی یەوە بەشێوەیەکی جوداو سەربەخۆ لەگەڵ گەلەکانیان دا دەدوێن ، لەسۆنگەی ئەوەوە کە هەرکام لەو گەل و کۆمەڵانە خاوەنی بارودۆخ و واقیعێکی تایبەتیەو لەگەڵ چەند دەردو نەخۆشیو کێشەیەکی تایبەتی دا دەستەویەخەبووە ، بەڵام هەر پێنجیان لەبواری بیروباوەڕو بنچینەی خەبات و شۆڕشەکانیان دا پێیان لەسەر یەک زەمینەی هاوبەش چەسپاندوەو ، هەموویان بەیەک دەنگ و بەیەک شێوە تەعبیر پێداگیری لەسەر چەند مەسەلەیەک دەکەن ، کە بە ئەسڵ و بنەماو بەردی بناغەی شۆڕش و خەباتی پێغەمبەرانە دادەنرێن ، کە ئەمانەن :

( .. أَلا تتقون ؟ إِني لكم رسول أَمين . فاتقوا الله وأَطيعون . وما أَسأَلكم عليه مِنْ أَجر إِنْ أَجري إِلاّ على رب العالمين ) .

١- بێدارکردنەوەو ڕاچڵەکاندن ( أَلا تتقون ؟ ) .

٢- ڕابەرایەتی و چاوساغیەکی جێی دڵنیایی و متمانە پێکراو ( إِني لكم رسول أَمين ) .

٣- فەرمان کردن بە پارێزکردن لەخواو فەرمانبەری کردنی پێغەمبەری پێشەوا ( فاتقوا الله وأَطيعون ) .

٤- چاوەڕوانی نەکردن و داوانەکردنی پاداشت لە هیچ کەس ( وما أَسأَلكم عليه مِنْ أَجر ) .

٥- دڵی خۆ خۆشکردن و قەناعەتکردن بە کرێ و پاداشتی خوا ( إِنْ أَجريَ إِلاّ على رب العالمين ) .

هەڵبەتە ئەم پێنج بنچینە سەرەکیو هێڵە گشتیيە نەک هەر لەڕابردوودا بەڵکو ئێستاش و لەمەودواش هەر بە بەردی بناغەی هەموو خەبات و شۆڕشێکی خوایییانە دادەنرێنو، پێویستە شوێن کەوتووانی خەت و ڕێبازی پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام زۆرچاکیان سەرنج بدەن و هەمیشە لەبەرچاویان بن .

پێم وایە بەم بڕە توێژینەوەیەش ڕوون بۆوەو سەلمێنراش کە ڕاستە ( بانگەوازی پێغەمبەران لەئەسڵدا یەکەو شێوەکانی جیاجیان ) .

ئەلێرەشدا کۆتایی بەم ( دە ) خاڵە دێنین[1] کە

(١) هەرکەسێک بیەوێ شارەزایی زیاتر دەربارەی ئەمەو

ویستمان جۆرو چۆنیەتی کەسایەتی ( شخصیة ) ی پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوا ( علیهم الصلاة والسلام ) یان تێدا بخەینەڕوو ، ئومێدیشم وایە تا ڕاددەیەکی باش ئەو ( ویست ) و ئامانجە هاتبێتەدی .

ئێستاش دەچینە سەر باسێکی دیکە بەناوی :
( ئەنجام و بەرهەمی ئەم جۆرە بڕوا بەپێغەمبەران بوونە ).

---

.............................................................

بابەتانە کە لەم (١٠) خاڵەدا توێژرانەوە ، یان هەر بابەتێکی دیکە کە پەیوەندی بە ( پێغەمبەرایەتی و پێغەمبەران ) ەوە هەبێ ، وەدەست بێنێ دەتوانێ سەرنجی ئەم سەرچاوانە بدات ، کە منیش کەمو زۆر بۆ نووسینی هەندێک لەم باسانەی ڕابردن سەرنجم داون و سوودم لێ وەرگرتوون :

١- ( الشفا بتعریف حقوق المصطفى ) نووسراوی ( قاضي عیاض)ەو دوو شەرحی ( ملا علی قاري ) و ( خفاجي ) یشی بەسەرەوەیەو چوار بەرگی گەورەیەو لەوبارەوە بەچاکترین سەرچاوەی دەزانم .
٢- ( کتاب النبوات ) نووسراوی ( إبن تیمیة ) .
٣- ( موقف العقل والعلم والعالم من رب العالمین وعبادە المرسلین ) نووسراوی ( مصطفی صبری ) شیخ الأسلام للدولة العثمانیة ، کە چوار بەرگی قەبەیەو بەرگی چوارەم تایبەتە بە مەسەلەی ( پێغەمبەرایەتی ) یەوە ..
٤- ( الوحي المحمدی ) محمد رشید رضا .
٥- ( العقیدة الأسلامیة وأسسها ) عبدالرحمن حسن حبنکة المیداني .
٦- ( النبوة والأنبیاء ) محمد علی صابوني .
٧- ( النبوة والأنبیاء ) أبوالحسن الندوي .

# ئەنجام و بەرهەمی ئەم جۆرە بڕوا بە پێغەمبەران بوونە

خوێنەری بەڕێز !

وەک لە ئاڵقەی یەکەمی ئەم زنجیرەیەدا گوتمان ، هەروەک چۆن ڕووناک بوونەوەی نێوەوەو دەرگاو پەنجەرەکانی ژوورێک کە چرای تێدا داگیرساوەو ، میوەو بەردەرکردنی درەختێکی بەردار کە ڕوواوەو فراژوو بووە ، ئەنجامێکی سروشتی و مسۆگەرو چاوەڕوان کراوە ، کردارو ڕەفتارو ڕەوشت و ئاکاری مسوڵمانانەش میوەو بەرهەمێکی مسۆگەرو سروشتی یە لەهەر کەسێکدا کە بیروباوەڕی خواناسی تێدا سەقامگیرو پنج گرتوو بووە .

جا با لێرەشدا بزانین ، ئەنجام و بەرهەمی مسۆگەرو چاوەڕوان کراوی بڕوابوون بە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام لە دەرو دەروون ( ظاهر و باطن ) ی مرۆڤی مسوڵماندا چیەو چۆنە بەوجۆرەی کە باسکرا ؟!

یەکەم : خۆشترویستنیان لەهەموو کەسێک

بەڵێ یەکەمین ئەنجام و بەرهەمی چاوەڕوان کراوی بڕوابوون بە پێغەمبەران ئەوەیە ، کە باباى بڕوادارو مسوڵمان ، ئەو پێغەمبەرە بەرزو بەڕێزانەی لەهەموو کەس و هەموو شتێک خۆشتر بوێن ، تەنانەت لە نەفسی خۆشی !!

خوای بەرزو بێ وێنە لەوبارەوە فەرموویەتی : ( النبیُّ

أولى بالمؤمنين مِنْ أنفسهم ) الأحزاب / ٦ . واته :
پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - سەبارەت بە بڕواداران
لە نەفسی خۆیان لەپێشترە !

وە فەرموویەتی : ( ماكان لِأهل المدينة ومَنْ حولهم مِنَ الأعراب أنْ يتخلفوا عن رسول الله ولايرغبوا بأنفسهم عن نفسه .. ) التوبة / ١٢٠ . واته :
خەڵکی - شاری - مەدینەو ئەو عارەبە خێڵەکییانەی لە دەوریانن ، بۆیان نیە کە لەپێغەمبەری خوا دوابکەون - و نەچن بۆ جەنگ - وە نابێ نەفسی خۆیان لە - فیداکردن لەپێناوی - نەفسی وی دا لێ وەچاو بێ !

پێغەمبەرمان علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی : ( ثلاثٌ مَنْ كُنَّ فيه وَجَدَ بِهِنَّ حلاوةَ الأيمان : أن يكون الله ورسوله أحب إليه مما سواهما .. ) متفق عليه . واته :
سێ - شت - لەهەرکەسێک دا هەبن بەهۆی وانەوە شیرنایەتی بڕوای دەستگیربووە :- یەکەمیان - کە خوداو پێغەمبەرەکەی لەغەیری وان لەلا خۆشەویست تر بن .

دیسان فەرموویەتی : ( لايؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه مِنْ والده وولده والناس أجمعين ) متفق عليه . واته :
یەکێکتان بڕوا نایەنێ ، تا منی لەلا خۆشەویست تر نەبێ لە بابی و ڕۆڵەی و تێکڕای خەڵکی !

هەڵبەتە لەهەموو شتێک خۆشترویستنی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام زۆر شتان لەسەر ئینسان پێویست دەکات و نیشانەشی زۆرن ، بەڵام زەقترین و بەرچاوترینیان ئەوەیە کە بەوپەڕی ڕێزو حورمەتەوە ناویان بێنێ و لەدەمی ناوهێنانیان دا داوای پایەبەرزتر بوون و خێروخۆشییان

بۆ لەخوا بکات ، وەک خودا دەربارەی پێغەمبەرمان صلى الله عليه وآله وسلم فەرموویەتی :( إن الله وملائكته يصلون على النبي يا أيها الذين آمنوا صلوا عليه وسلموا تسليما ) الأحزاب / ٥٦ . واتە :

بێگومان خودا و فریشتەکانی سەڵەوات دەنێرنە سەر پێغەمبەر ، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە سەڵەواتی لەسەر بدەن و سەلامی بۆبنێرن .

بۆیەش لەدەمی ناوهێنانی هەرکام لە پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام دا، گوتنی ( صلى الله عليه وسلم ) یان ( صلى الله عليه وآله وسلم ) [1] سوننەت و ئەدەبێکی بەرزی ئیسلامییە ، بەڵام بەتایبەتی پێغەمبەرمان ( محمد ) صلى الله عليه وسلم ، وەک فەرموویەتی :( مَنْ صَلّىٰ عَلَيَّ صلاةً صلى الله عليه بها عشرا ) رواه مسلم . واتە : کەسێک سەڵەواتێکم لەسەر بدات ، خوا بەوە (١٠) سەڵەواتی لەسەردەدات .

وە فەرموویەتی :( البخيل مَنْ ذُكِرْتُ عنده فلم يصل عليّ) رواه الترمذي وقال حسن صحيح . واتە : ڕژدو چرووک کەسێکە کە ناوی منی لەلا باس دەکرێ بەڵام سەڵەواتم لەسەر نادات .

---

(١) ڕوونکردنەوەیەک دەربارەی مەعنای :
( صلاة ) و ( سلام ) :
وشەی ( صلاة ) لەئەسڵی زماندا وەک ( راغب الاصفهاني ) دەڵێ لەلای زۆربەی زانایان واتە : پاڕانەوەو بەپیرۆز گرتن و بەگەورەگرتن ، لەزاراوی شەرعیشدا لەلای جەماوەری زانایان ( جمهور العلماء ) بەگوێرەی ئەو سەرچاوەیەی لێیەوە دەنێررێ واتاکەی دەگۆڕێ ، ئەگەر لەخواوە بێ بۆ

دووەم : گرتنی خەت و ڕێبازیان .

یەكی دیكە لە ئەنجام و بەرهەمە سروشتییەكانی بڕوابوون بە پێغەمبەرانی خوا صەلات و سەلامی خوایان لێ بێ ، ئەوەیە كە مرۆڤی مسولْمان ئەو خەت و ڕێبازە بگرێ كە ئەوانـــــی لەسەربوو ون و ، بێجگە لەوان هیچ كەسێكی دیكە بە ڕابەرو چاوساغ و پێشڕەوی خۆی دانەنێ ، چونكە خوا پێغەمبەرانــــی بۆ ڕابەرایەتیی و چاوساغیی خەڵكی ڕەوانەكردوون و ، بـــۆ ئەوەش كە بەچاكی بتوانن ئەو ئەركە مەزنە جێ بەجێ بكەن، سەرڕاست و شارەزای ڕێ ی ڕاست ( الصراط المستقيـــــم ) ی كردوون و دڵ و مێشكی بە زانیاری ڕاست و پێویـــــــست ڕوون كردوونەوەو ، لەهەڵەو پەڵەو لادان و ڕێ بزركـــردن پاراستوونی .

---

............................................................

بەندەكانی ئەوە مانای ( بەزەیی نواندن ) و ( پایـــــە بەرزكردنەوە ) و ( پێهەڵگوتن ـ ثناء ) دەگەیەنێ، وە ئەگەر لە فریشتان یان لە مرۆڤانەوە بێ بۆ پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام ، وە بۆ غەیری وانیش لە بڕواداران ، ئەوە بریتیە لە لەخودا داواكردنی ( بەزەییو پایەبەرزكردنەوەو پێهەڵگوتن ) بۆیان .

وشەی ( سلام ) یش لەئەسڵی زمان دا وەك ( راغب ) دەڵێ واتە : ساغ و سەلامەتیو بێ عەیبیی دەرو دەروون، وە (سلام ) ناردنیش وەك ( صلاة ) ناردن ، بەپێی ئەو سەرچاوەیەی كە لێیەوە دەنێرڕێ ماناكەی دەگۆڕێ ، ( سلام ) ناردنی خوا بۆ بەندەكانی یانی ڕەخساندنی سەلامەتیو بێ عەیبی بۆیـان ، وە ( سلام ) ناردنی فریشتان و مرۆڤان بۆ پێغەمبـــەران و غەیری وانیش واتە : داواكردنی هاتنەدی و زیادبوونـــی سەلامەتیو بێ عەیبی بۆیان .

بڕوانە :( معجم مفردات ألفاظ القرآن ) ص ٢٣٩ ، ٢٨٥.
وە بڕوانە :( إعانة الطالبين ) ج١ ص١٢ .

خوای شارەزاو زانا فەرموویەتی :( لقد كان لكم في رسول الله أسوة حسنة .. ) الأحزاب / ٢١ . واتە :

بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا پێشڕەوایەتییەكی چاك هەیە بۆ ئێوە ..

پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی :( فعلیكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدین المهدیین عضوا علیها بالنواجذ .. ) رواه ابوداوود والترمذي وقال حسن صحیح . واتە : جا ڕێ و شوێنی من و ڕێ و شوێنی جێ نشینە سەرراستە ڕێڕەوونی كراوەكان بگرن ، ددانانی لەسەر ڕۆگرن .. !

بێگومان كەسێكیش پێغەمبەرانی لەهەموو كەس لەلا بەڕێزترو خۆشەویستتربن و ، بڕواشی وابێ كە سەرتۆپی مرۆڤایەتیو كامڵترین ئینسانن ، بەهیچ ڕەنگێك بەخۆی ڕەوا نابینێ بێجگە لەوان وەدوا كەسی دیكە بكەوێ .

مادام وابێ كەسانێك كە خەتو ڕێبازو ڕێ و شوێنی پێغەمبەرانیان لەبەردەستدایەو دەكەونە شوێن ئەملاولاو ملی كوێرە ڕێ و ( ڕێچكان ! ) دەگرن ، شایەدی یەكی زۆر، بەهێز لەسەر خۆیان دەدەن كە مەسەلەی بڕوابوونیان بە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام لافلێدانێكی ڕووتو بێ بنچینەیەو ، قسەیەكی بێ پشتو پەناو بۆشەو هیچی دیكە .

<u>سێ یەم</u> : خۆشویستنی دۆستانیان و پشتگرتنیان .

بەڵێ یەكی دیكە لە ئەنجام و بەرهەمە مسۆگەرو چاوەڕێ كراوەكانی بڕوابوون بە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام ئەوەیە كە هەموو ئەو كەسانەی كە خەتی وان دەگرن و

دۆست و پشتیوانیانن ، خۆشی بوێن و دۆستایەتیو برایەتییان لەگەڵ بگرێ .

خوای بێ وێنەو تاک فەرموویەتی : ( والمؤمنون والمؤمنات بعضهم أولیاء بعض .. ) التوبة / ٧١ . واتە :
وە پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار هەندێکیان پشتیوانی هەندێکیانن ..

دیسان خوای پایەبەرزو بەخشەر لەوەسفی ئەو مسوڵمانانەدا کە لەپاش کۆچکەرو پشتیوانەکان ( المهاجرون والأنصار )ەوە دێن ، کە ئێمەو هەر مسوڵمانێکی دیکەش دەگرێتەوە ، هەر لەسەردەمی پێغەمبەر صلی الله علیه وآله وسلم بەملاوە تا ڕۆژی دوایی ، دەفەرموێ :
( والذین جاؤا من بَعْدِهم یقولون ربّنا اغفر لنا ولأخواننا الذین سبقونا بالأیمان ولاتجعل في قلوبنا غلاًّ للذین آمنوا ربنا إنک رؤوف رحیم ) الحشر / ١٠ . واتە :
وە ئەوانەی لەدوایانەوە ـ لەدوای ( المهاجرون والانصار ) ـ دێن ، دەڵێن :
پەروەردگارمان لە ئێمەو لەو برایانەمان ببوورە کە پێش ئێمە بڕوایان هێناوە ، وە ڕق و کینەمان مەهاوێ دڵی سەبارەت بەو کەسانەی بڕوایان هێناوە ، پەروەردگارمان بەڕاستی تۆ میهرەبان و بەبەزەییی !
پێغەمبەریش صلی الله علیه وآله وسلم فەرموویەتی :
( والذي نفسي بیده لاتدخلوا الجنة حتی تؤمنوا ، ولاتؤمنوا حتی تحابوا .. ) رواه مسلم . واتە :
سوێند بەو زاتەی گیانمی بەدەستە ! هەتا بڕوانەیەنن ناچنە بەهەشتێ ، وە بڕوانایەنن هەتا یەکدیتان خۆش نەوێ ..

جا بێگومان چاکترین و گەورەترین دۆست و پشتیوانی پێغەمبەرمان علیه الصلاة والسلام برادەرە بەڕێزەکانی خوا لێیان ڕازی بێ ، بەتایبەتی کۆچکەرو پشتیوانەکان ( المهاجرون والانصار ) ، کەواتە لەسەر هەرکەسێک پێویستە کە بڕوای بە پێغەمبەرمان هەیەو خۆشی دەوێت ، ئەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستیشی هەبێ بۆ برادەرە بەڕێزەکانی بەگشتی و بۆ کوچکەرو پشتیوانەکانیش بەتایبەتی ، خوا لێیان ڕازی بێ ، گەورەترین و زەقترین نیشانەی ڕێزو خۆشەویستیش سەبارەت بەو زاتە مەزنانە ، ئەوەیە کە بەڕێزەوە ناویان بهێنرێ و لەدەمی ناوهێنانیان دا ڕەزامەندی خودایان بۆ داوابکرێ و بگوترێ(رضي الله عنهم) خوا لێیان ڕازی بێ(1)، چونکە خودا جل جلالە لەگەڵ ئەو هەموو گەورەیی و بەرزییەیدا لەکاتی ناوبردنیان دا فەرموویەتی :( رضي الله عنهم .. ) التوبة / 100 .

---

(1) گوتراوە :( هەموو یاسایەک ڕیزپەڕ- شاذ - ی هەیە ) ، لەنێو برادەرانی پێغەمبەریش دا خوا لێیان ڕازی بێ ، ئەی وا هەیە ، کە دەبێ لەجیاتی ( رضي الله عنه ) خوا لێی ببورێ ( غفر الله لە ) ی بۆ بگوترێ ، بۆ نموونە : ( ابوسفیان و معاویة و عمرو بن العاص و مغیرة بن شعبة )! خوا لێیان ببورێ .

کەسێکیش کە بەم قسەیەم قەڵس دەبێ ، وادیارە بە " چاوپێچکی " ( وما جرى بين الصحابة نسكت عنه ) بەرچاوی خۆی گرتوەو وەک پێویستیش ئاگای لە مێژوو نیە .

بەڵام لێرەدا خستنەڕووی چەند ڕاستییەک بەپێویست دەزانم :

1- من کە دەڵێم هاوەڵانی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام هەموویان لەیەک ئاستدا نین و ئی وایان هەیە ( غفر الله لە ) ی لێ دەوەشێتەوە نەک ( رضي الله عنه ) ، تەنیا مەبەستم ئەوەیە کە لە ناسینی ئیسلام دا بەهەڵەدا نەچین و

لەکاتی ڕوونکردنەوەی بەرنامەی خوادا خاتری هیچ کەس نەگرین ، کەواتە با هیچ کەس واتێ نەگات من دەمەوێ لە ڕێزو پلەوپایەی هەندێک لە ( أصحاب ) دابشکێنم !!
نەخێر ، بەڵام ئامادەش نیم بۆخاتری هیچ کەس چاو لە ڕاستییەکانی ئیسلام بقووچێنم !
٢- بێگومان ئەو جۆرە کەسانەی کە من ئاماژەم پێ کردن زۆر نین و بە پەنجەی دەستان دەژمێررێن ، کەواتە با هیچ کەس ئەم ڕایەی من نەکاتە دەستەچیلەی لە ( أصحاب ) کەوتنە گومان و دوودڵییەوە ، چونکە زۆر ناماقووڵ و بێ جێیە کەسانێک خوا بەگشتی پاکانە ( تزکیة ) ی کردبن ، تۆش لێیان بکەویە گومانەوە !
٣- ئەو کەسانەی کە لەژێر پەردەی خۆشویستنی ( أهل البيت )و بنەماڵەی پێغەمبەردا صلى الله عليه وآله وسلم هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر بەگشتیو ناودارانیان بەتایبەتی دەبوغزێنن و ، ناوو ناتۆرەی خراپیان بەدوا دەخەن، ئەوانە هیچ جیاوازی یان لەگەڵ ئەوانەدا نیە کە کاتی خۆی لەژێر پەردەی لایەنگری ( أصحاب ) دا ( أهل البيت )یان دەبوغزاند ، هەربۆیەش جەماوەری زانایان هەرکام لەم دوو تاقمەیان بەهەڵە داناون و، هەر لەکۆنەوەش بە تاقمی یەکەمیان گوتوە ( رافضي )یەکان و ، بە ئی دووەمیش ( ناصبي ) یەکان .
ئنجا جەماوەری مسوڵمانان کە بە ( أهل السنة والجماعة ) ناسراون ڕێزگرتن و خۆشویستنی هەرکام لە هاوەڵانی پێغەمبەرو صلى الله عليه وآله وصحبه وسلم بنەماڵەکەییان بەپێویست زانیوە ، هەربۆیەش ئیمامی ( شافعي ) خوا لێی خۆش بێ دەربارەی خۆشویستنی بنەماڵەی پێغەمبەر صلى الله عليه وآله وسلم فەرموویەتی :

إنْ كان رَفْضاً حُبُّ آل أحمد
فليشهد الثقلان أني رافضي

وە ( إبن تيمية ) ش دەربارەی خۆشویستنی هاوەڵانی پێغەمبەر فەرموویەتی :

إن كان نَصْباً حبُّ أصحاب محمد
فليشهد الثقلان أني ناصبي

يمن على مَنْ يشاءُ مِنْ عبادە ) .

پێغەمبەرانیا ـ علیهم الصلاة والسلام ـ پێیان گوتن : ئێمەش بەس مرۆڤین وەک ئێوە ، بەڵام خوا هەرکەسێک کە بیەوێ لە بەندەکانی چاکەی لەگەڵ دەکات . ـ واتە پلەی پێغەمبەرایەتی پێ دەبەخشێ ـ ) .

وەک پێشتر ڕوونمان کردەوە ئەم قسەیە وەڵامی پڕبەپێستی ڕەخنەو بەهانەی یەکەمی بێ بڕوایانە .

لە وەڵامی بەهانەی سێیەمیش دا دەڵێن : ( وماكان لنا أن نأتيكم بسلطان إلاّ بأذن الله ) ( وە بۆمان نیە کە هیچ بەڵگەیەکتان بۆ بێنین بەبێ فەرمانی خودا ) .

بەڵێ پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام بەندەی خودان و زۆر لەوە بەئەدەب ترن کە پێشنیاران پێشکەشی خودا بکەن و داوای بەڵگەو موعجیزەیەکی لێ بکەن کە فەرمانی لەسەری نیە .

وەک دەبینین پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام هیچ وەڵامی بەهانەی دووەمیان نەدایەوە ، چونکە ناماقووڵی و بێجێیی وی ئاشکراو بەڵگەنەویستەو حەوجێی بەرپەرچدانەوە ناکات . ئاخر ڕچەی باب و باپیران ئەگەر ڕاست و بەجێ بێ ئەوە پێغەمبەران هەوڵی پتر چەسپاندنی دەدەن ، ئەگەر هەڵەو خواریش بێ ، ئەوە لەجیاتی گلەیی و گازندە دەبوو ئەو زلەزلە دنیاخۆرانە زۆریش سوپاسی پێغەمبەرانیان کردبایە کە لە ڕێی چەوت و خوار دەیانگێڕنەوەو ڕێی ڕاستیان پیشان دەدەن .

ئنجا لەکۆتاییدا پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام بێ منەتانە پشت بەقەڵای مەحکەمی دەسەڵاتی خوا دەدەن و دەڵێن :( علی الله توکلنا وعلی الله فلیتوکل المؤمنون ) ( بەس پشتمان بەخوا بەستوە ، وە با بڕواداران بەس پشت بەخوا بدەن ) .

ئنجا بۆ زیاتر بێ منەتیو بێ باکی دەربڕین و پیشاندانی خۆیان دەڵێن :( وما لنا ألّا نتوکل علی الله وقد هَدٰینا سبلنا ولنصبرن علی ما آذیتمونا وعلی الله فلیتوکل المتوکلون ) ( وە لەبەرچی پشت بەخوا نەبەستین ، مادام لە کاروبارمان دا ڕێڕوونی کردووین ؟ وە بێگومان خۆڕا دەگرین لەسەر ئەو ئازاردانەی ئێوە ، وە با پشت بەستوان بەس پشت بەخوا ببەستن ) .

بەڵێ ڕێ ی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام بەگوڵان نەچێنراوەو لەهەمووی ئارەق و خوێن ڕژاوەو ، هەرکەسێک بیەوێ بێ قۆرت و گرێ و فیسق و گەوە ئەو ڕێ یە سەخت و دژوارە ببڕێ ، دەبێ دەیان و سەدان جۆرە مەینەتی و ئێش و ژان و چەرمەسەری لەخۆی بگرێ ، دەنا با دانیشێ و دەست لەکاری پیاوان نەدات و پارووی لە گەرووی زلتر نەکات !!

## هەڕەشەو گوڕەشەی بێ بڕوایان باش تێشکان وبەزین

ئنجا لەکۆتاییدا سەرانی کوفرو بێ بڕوایانی کەللەئیشک و کۆنەپەرست و ستەمکار ، وەک عادەتی هەمیشەییـــان دوایین تیری شێو تیردانیان داوێن و ، دەست دەکەن بە هەڕەشەو هەڕو گیف و قسەپڕژاندن و دەڵێن :

( وقال الذين كفروا لرسلهم لنخرجنكم مِنْ أَرضنا أَو لتعودن في ملتنا ) ( وە ئەوانەی بێ بڕوان بەپێغەمبەرەکانی خوایان گوت : حەتمەن یان لەخاکی خۆمان وەدەرتان دەنێین یان دەبێ بگەڕێنەوە سەر ڕچەی ئێمە ! ) .

بەواتایەکی ڕوونتر : بێ بڕوایان بەپێغەمبەرەکانی خوایان گوت : ئەگەر بەوجۆرەی ئێمە دەمانەوێ لەخاکی ئێمەدا دەژین چاکە ، دەنا لێرە جێتان نابێتەوە !

بێگومان ئەم شێوە گوتارو ڕەفتارەش یەکی دیکەیە لە نیشانەو درووشمە هەرە زەقەکانی خوانەناس و بێ بڕوایانی ستەمکار بەدرێژایی مێژوو !

دیسان دەربەدەری و ئاوارەبوون و خاک و ئاو بەجێهێشتن و کۆچکردنیش یەکی دیکەیە لە خەسڵەت و نیشانە بنەڕەتییەکانی پێغەمبەرانی خوای زاناو تواناو شوێن کەوتووانی ڕەسەن و ڕاستەقینەیان لەهەموو چاخ و ڕۆژگارێکدا .

چونکە هەرچەندە باباى خواناس و مسوڵمان خاک و ئاوو نیشتمانی خۆی خۆش دەوێ و حەز لە تێدامانەوەی دەکـات ،

بەڵام دڵی پێوە نابەستێ‌و ناپەرستێ‌و، هەرکاتێک بارو دۆخێکی وا هاتەپێش کە ڕێی خواپەرستی‌و بەڕێوەبردنی بەرنامەی خوای لێ بگرێ، خوداو بەرنامەکەی هێندە لەلا شیرین و بەڕێزو خۆشەویستن کە بتوانێ لەپێناوی وان دا دەست بەرداری هەموو شتێک بێ‌و هەموو شتێک وەلابنێ کە دەبێتە پەرچ و تانەی خواپەرستی‌و خوا ڕازی کردنی .




## خودا لەسەر بەندەکانی وەدەنگ دێ

ئنجا پاش ئەوەی بێ بڕوایانی ستەمکار ئەو بڕیارە بێ ویژدانە دڕندانەیان لەبارەی پێغەمبەرانەوەدا، علیهم الصلاة والسلام، دۆست و یاریدەدەرو پشتیوانی میهرەبان و بەهێزیان لەسەریان وەدەنگ دێ و دەفەرموێ: ( فأوحى إليهم ربهم لنهلكن الظالمين ) ( جا پەروەردگاریان پێی ڕاگەیاندن، کە بێگومان ئێمە ستەمکاران لەنێو دەبەین ).

بەڵێ ئەگەر بێت و بەندە ڕەسەنەکانی خودای دادگەر هەرچی لەدەستیان دێ لەپێناوی خوادا بیکەن، دوای ئەوەی بڕستیان لێ بڕاو تینیان تێ نەما، خودای بەبەزەیی و تۆڵەستێن لەباتی وان وەدەنگ دێ و دەست بەکار دەبێ !

ئنجا پاش ئەوەی خودا موژدەی لەنێوبردنی ستەمکارانی

بەپێغەمبەران دا ، موژدەی وەسەرخستن و نیشتەجێبوونیشیان لەزەوی دا پێ دەدا :( ولنسكننكم الأرض مِنْ بعدهم ) ( وە بێگومان لەپاش وان لەزەوی دا نیشتەجێتان دەكەین ). واتە دەتانكەینە میراتگری ستەمكارانی دنیاخۆرو ، دەستەلاتتان پێ دەبەخشین و جلەوی هەلسووڕاندنی كاروباری ولاتتان پێ دەسپێرین .

بەلام ئایا ئەو موژدەو بەلێنە لەهەموو كەس دەوەشێتەوەو بەهەموو كەس ڕەوا دەبینرێ ؟

خودای قسەلەجێ وەلام دەداتەوەو دەفەرموێ :( ذلك لِمَنْ خاف مقامي وخاف وعيد ) ( ئەوە – واتە ئەو موژدەیە – بۆ كەسێكە كە لە پلەوپایەی من بترسێ و لە هەڕەشەی من بترسێ ) .

بەلێ موژدەو بەلێنی خوا تایبەتە بەكەسانێكەوە كە ترس و سامو ڕێزی پلەوپایەی بلێندی خوایان دلی پڕ كردوون و ، جێی ترس و سامی كەسی دیكەی تێدا نابێتەوە ، وە موژدەی خوا تایبەتە بەوانەوە كە بەس لە هەڕەشەی خوا دەترسێن و گوێ نادەنە هەڕەشەو گوڕەشەی كەسی دیكە .

## ئەنجامی دەبەرێك ڕاچوونەكەو وناهەی

ئنجا خوای بێ وێنە ئەنجامو ئاكامی دەبەرێك ڕاچوونی پێغەمبەران و سەرانی كوفرمان بۆ دەخاتەڕوو ( واستفتحوا

وخاب كل جبار عنيد ) ( وە پێغەمبەران داوای یارمەتی و سەرکەوتنیان کرد ، وە هەر زۆردارێکی کەللە رەق زیانبار بوو ) .

بەڵێ حەتمەن کەسانێک لەگەڵ دۆست و خۆشەویستانی خوادا بەشەڕبێن و دەگژیان ڕابچن ، دەبێ هەر بارێ بنەوەیان پێ ببرێ و لە مەیدانێ دا تخێڵ بن . (١)

بەڵام وەنەبێ کەسانێک کە لەگەڵ خوا و دۆستانی خوادا دەجەنگن هەر بەوەندە وازیان لێ بهێنرێ کە لەدنیادا بدۆڕێن و تێ بشکێن ، ( من وراءه جهنم ويُسقى مِنْ ماء صديد ) ( دۆزەخیش لەدواوەیەتی ، وە لەئاوێکی بەگەرووی‌دا دەکرێ کە کێم و زووخاوە ) .

جا ئایا کێم و زووخاو قووت دەچێ ؟!

( يتجرعه ولايكاد يسيغه ) ( بەزەحمەت قمقم قووتی دەدات و خەریکە بۆی قووت نەچێ ! ) .

هەڵبەتە کەسێک لەحاڵێکی وادا بێ ، مردن و گیان دەرچوونی شتێکی یەکجار نیزیک و چاوەڕوان کراوە ، بۆیە فەرموویەتی :( ويأتيه الموت مِنْ كل مكان ) ( لەهەموو لایان ڕا مردنی بۆدێ ) .

واتە هێندە ئازار و ئێشێکی بەسفت و سۆو ژانی هەیە ، کە ئازاری هەر شوێنێک و هەر ئەندامێکی بەسە بۆ مراندنی !

بەڵام ئایا بەمردن قوتاری دەبێ و ، خودای دادگەرو تۆڵەستێن مردنیش بەکەسانێکی ئاوا ڕەوا دەبینێ ؟!

( وما هو بميت ) ( بەڵام ناشمرێ ) .

---

(١) تخێڵ بوون : لەسەر گازی پشت کەوتن .

بەڵێ تەنانەت مردنیش کە ناخۆشترین شتە بە سەرانی کوفرو شوێن کەوتووانیان ڕەوا نابینرێ !

ئنجا لەکۆتاییدا دەفەرموێ : ( ومن وراءه عذاب غلیظ ) ( وە ئازارێکی سەختو قەبەی لەدواوەیە - و چاوەڕێی دەکات - ) .

بەڵێ ئەمەیە ئاکامو سەرەنجامی دەبەرێک ڕاچوونی هەق و باطل ، بەڵام بەمەرجێک !

دەزانی ئەویش چییە ؟!

ئەوەیە کە هەروەک چۆن ( باطل ) بەڕاستیو بە مەعنای وشە باطل و ناهەقە ، هەقیش بەڕاستیو بە مەعنای تەواوی وشەی ( حق ) هەق بێت و ، خڵتەوخاڵ و گرێ و گۆڵی ( باطل ) ی پێوەنەمێنێو تەواو بۆخوا ساغ و یەکلا ببێتەوەو ، لەڕیزی ناهەق جودا ببێتەوە !!

ئیدی بەهیوای هاتنەدی بەرەیەکی هەقی ئەوتۆ ، لە داهاتوویێکی نیزیک دا لە نێو گەلی کوردو تێکڕای ئوممەتی ئیسلامدا .

وما ذلک علی الله بعزیز .

چوارەم

# بڕگولێک دەربارەی بیرەوەری لەدایک بوونی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم

## پێشەکی

خوێنەری بەڕێز !

ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی بیرەوەری لەدایک بوونی شاگوڵی باغی بوونەوەر پێغەمبەری ڕابەرو سەروەر صلی اللە علیە وآلە وسلم ەو بۆچەند سەدەیەک دەچێ لەنێو جیهانی ئیسلام دا بۆتە باوو ڕەواجی پەیداکردوەو هەموو ساڵێ موسڵمانان (١) لە (١٢) ی مانگی ( ربیع الأول ) دا کەیف و شادی دەردەبڕن و خواردەمەنیو شیرینی دەبەشنەوەو ، وتاران دەنووسن و دەخوێننەوە ، سەبارەت بەوەی کە لەو ڕۆژەدا گەورەترین ئینسان و ڕاستترین بەندەو مەزنترین پێغەمبەرو چاکترین پێشەوا ، بە پێی بەپێزی خۆی زەوی پیرۆز کردوەو ، بەڕووناکیو شەبەقی بوون ( وجود ) ی تاریکیی کوفرو نەفامیو خراپەکاری و ستەمو چەوساندنەوەو بێدادی ڕامالیوەو دنیای شوعلەوەر کردوە .

ئنجا هەوجێ بە باسکردنێ ناکات کە عادەتی ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی یادکردنەوەی ڕۆژی لەدایک بوونی پێغەمبەرەوە علیە الصلاة والسلام دیاردەیەکی نوێ و پەیداکراوەو لەسەردەمی پێغەمبەرو خەلیفە ڕاشیدەکان دا نەبووە .

---

(١) موسڵمانانی شیعە مەسلەک (١٧)ی مانگی ( ربیع الأول ) بەڕۆژی لەدایک بوونی پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام دادەنێن .

ئنجا ئایا دیاردەی گۆڕین بە داهێنراو ( بیدعة )
لەقەڵەم دەدرێ یان نا ؟! وە ئەگەر بە بیدعەش لەقەڵەم
بدرێ ئایا بە داهێنراوێکی چاک ( بدعة حسنة ) دادەنرێ
یان بە داهێنراوێکی خراپ ( بدعة سيئة ) ، ئەوە لەنێو
زانایان دا کێشەو وتوویژی زۆر لەسەر کراوەو ئێستاش
دەکرێ ، بەڵام من نە بەپێویستی دەزانم و نە ئێرەش ئەو
دەرفەتەم دەدات کە خۆم تێکەڵی ئەو مشتومڕە بکەم ،
ئەوەندە هەیە هەروا بەکورتی هەڵوێستی خۆم لەوبارەوە
لەچەند خاڵێک دا ڕادەگەیەنم :

١- من ڕام وایەو ڕایەکەشم هەڵهێنجراوی قورئان و سوننەت و
قسەی زانایانی ئیسلامە نەک ئی گیرفانی خۆم ، کە بیدعەت
بەس بەو شتانە دەگوترێ کە لەبواری خواپەرستیی ڕووت
( العبادة المحضة ) دا دادەهێنرێن ، وەک : نوێژ ، ڕۆژوو ،
حەج ، زیکر ، سوێندخواردن ، نەزر ، قوربانی ..

بۆ سەلماندنی ئەم ڕاو بۆچوونەشم بەڵگەم زۆرن ، بەڵام
لێرەدا دەرفەتی خستنەڕوویانم نیە .

٢- کەواتە : مادام بیدعەت لەجوغزی خواپەرستیدا کورت
هەڵاتبێ ، هیچ پێویست ناکات قسە لەوە بکەین داخوا مەسەلەی
ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی یادی لەدایک بوونی پێغەمبەرمانەوە
عليه الصلاة والسلام بیدعەتە یان نا ، وە ئایا بیدعەتێکی
چۆنەو چۆن نیە ، چونکە مەسەلەی ناوبراو لەجوغزی هەڵس و
کەوتان ( دائرة المعاملات ) دایە ، نەک خواپەرستییەکان
( العبادات ) ، دیارە بیدعەتیش لەڕوانگەی شەرعەوە ئەوەیە
- کە وەک گوتمان - لەبواری خواپەرستیدا دابهێنرێ ، چونکە
وەک زانایانی ( أصول الفقه ) فەرموویانە : ( الأصل في

العبادات الحظر ، والأصل في المعاملات الأباحة ) .[1]

٣ـ ئەوە کە هەندێک لە زانایان بیدعەتیان کردۆتە دوو بەش چاک و خراپ ، وەک : ( شافعيو نووي و ابن حجر الهیتمي ) خوا لێیان خۆش بێ ، یان فەرموویانە : بیدعەت پێنج حوکمەکان ( الأحکام الخمسة ) ی بەسەردا دەچەسپن ، واتە بیدعەت هەیە فەرزەو هەیە سوننەتەو هەیە ناپەسند (مکروە)ەو هەیە موباحەو هەیە حەرام ، ئەوە بۆیە هەڵوێستیان وابووە چونکە واتای وشەی بیدعەتیان زۆر بەفراوانی تەماشاکردوەو هەردووک بواری هەڵس و کەوتەکان و خواپەرستییەکان ( المعاملات والعبادات ) یان پێ گرتۆتەوە ، دیارە لەحاڵێکی واشدا ، دابەش کردنی بیدعەت بەچاک و خراپ یان بە فەرزو سوننەت و موباحو ناپەسندو حەرام ، ڕاست دەردەچێ ، ئەوەندە هەیە ئەوکاتە ناچاردەبین بڵێین : فەرموودەی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام ( .. فأن کل بدعة ضلالة .. )[2] ، بەس مەبەستي پێ بیدعەتە لەبواری خواپەرستیدا ، بەڵام ئەگەر گوتمان بیدعەت بەس بەو شتانە دەگوترێ کە لەبواری خواپەرستیدا لە ئاییندا زیاد دەکرێن و دادەهێنرێن ، ئەوکاتە فەرموودەی ناوبراو حەوجێی بە ( تخصیص ) و ( تأویل ) کردن ناکات و دیارە هەر ئەوەش ڕاستترو چاکترە ، بگرە هەر ئەوەش ڕاست و چاکە !![3]

---

(١) بۆ وێنە بڕوانە کتێبي ( القواعد النورانیة الفقهیة ) نووسراوی ( ابن تیمیة ) .

(٢) رواه أبوداوود والترمذي .

(٣) لەکتێبی : ( ڕێبازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کامەیە ؟! )دا باسێکي سەربەخۆمان دەربارەی بیدعەت نووسیوە ؛ دەتوانی بۆ زیاتر شارەزابوون لەوبارەوە سەرنجی بدەی . بڕوانە لاپەڕە ( ٢٥٧ تا ٢٧٢ ) چاپی یەکەم .

٤ـ كەواتە : ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی یادی لەدایک بوونی پێغەمبەرەوە علیە الصلاة والسلام ئەگەر بەشێوەو چۆنیەتێکی شەرعیی‌یانەو بۆ مەبەستێکی چاک و شەرعی بەڕێوەببرێ ، هیچ کەس ناتوانێ بەناوی شەرعەوە بەخراپی دابنێ ، چونکە ئەگەر مەبەستی ئەوەبێ کە بیدعەتە ، بیدعەت نیە ، لەبەرئەوەی کە لەبواری خواپەرستیدا نیە ، لەبواری ( معاملات ) یشدا بۆ حەرام کردن و بەخراپ دانانی هەرشتێک و هەر هەڵس وکەوتێک پێویستە بەڵگەی شەرعی سەربەخۆمان هەبێت ، چونکە وەک پێشتر گوتمان لەبواری هەڵس وکەوتەکاندا ئەسڵ و بنچینە حەڵاڵیو ڕێگادانە مەگەر بەڵگە هەبێ لەسەر قەدەغەکردن ، بەپێچەوانەی بواری خواپەرستییەوە کە ئەسڵ و بنچینە لەویدا پابەندێتی بەدەقان ( نصوص ) ەوەو بەملاولادا نەچوونە !

ڕوونتر بڵێین :

ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی یادی لەدایک بوونی پێغەمبەری سەروەرمانەوە علیە الصلاة والسلام لەزاتی خۆیدا خراپ نیە ، بەڵام ئەگەر هاتو بەشێوەیەکی بێ شەرعیی‌یانە بەڕێوەبرا ، یان شتی بێ شەرعی تێدا ڕوودا وەک تێکەڵ بوونی ئافرەت و پیاو ، یان خوێندنەوەی شیعرو تارێک کە لەگەڵ شەرع دا دژ بوەستێو زیانی ئیسلامی تێدا بێت ، ئەوە ئەوکاتە ئاهەنگی ناوبراو بەخراپ و بێ شەرعی لەقەڵەم دەدرێ، بەڵام نەک لەبەر زاتی خۆی بەڵکو لەبەر ئەو خراپەو بێ شەرعی ـ یانەی کە تێیدا ڕوودەدەن !

خوێنەری خۆشەویست !

لەسۆنگەی ئەوەوە کە مەسەلەی ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی

یادی لەدایک بوونی پێغەمبەرەوە علیە الصلاة والسلام لەڕابردوودا و ئێستاش کێشەو مشت ومڕی زۆر لەسەرکراوەو دەکرێ ، وای بەچاک دەزانم بەرلەوەی ئەم ( ڕێ خوشکردن) ە بەجێ بهێڵین ، نەختێک دەربارەی شەرعیی بوونی بدوێم :

هەرچەندە وەک پێشتر گوتمان مەسەلەی ( مەولوود خوێندنەوە ) و هەر مەسەلەیەکی دیکەش کە دەکەوێتە جوغزی ( معاملات ) ەوە ، بۆ شەرعیی بوونیان پێویستیمان بە بەڵگەهێنانەوە ناکات ، چونکە ئەسڵ لە هەڵس وکەوتەکاندا حەڵاڵییە ، بەڵکو کەسێک کە لافی حەرامبوونی یەکێک لەو شتانە لێ بدات ، ئەو پێویستی بەبەڵگە هەیە بۆ ئیسپاتی دەعوایەکەی ، ئەمەش بۆخۆی بەتەنیا گەورەترین و پتەوترین بەڵگەی شەرعیی بوونی مەسەلەی ناوبراوە ، بەڵام بۆ زێدە دڵنیایی و لاچوونی گرفت و خوتخوتەی هەندێک دڵان ئەم چەند قسەیەش دەکەم :

یەکەم : خوای بەرزو زانا دەربارەی پێغەمبەرمان علیە الصلاة والسلام فەرموویەتی : ( إِنا أُرسلناک شاهدا ومبشرا ونذیرا لتؤمنوا بالله ورسوله وتُعَزِّروه وتُوَقِّروه وتُسَبِّحوه بُکَرةً وأُصیلا ) الفتح / ٨ ، ٩ . واتە :

ئێمە تۆمان ناردوە کە چاودێرو موژدەدەرو ترسێنەربی ، بۆئەوەی ـ ئەی بڕوادارینە ـ بڕوا بەخواو بەپێغەمبەرەکەی بێنن وە پشتیوانیی بکەن و ڕێزی بگرن ، وە بەیانیان و ئێواران ـ خوا ـ بەپاک بگرن .

هەڵبەتە دەگونجێ کە مەبەست لە ڕاناوی سەر هەرسێک وشەکانی ( تعزروه وتوقروه وتسبحوه ) خوا بێت ، بەڵام پێم وایە ئەوەی من هەڵم بژاردوە ـ دیارە توێژەرەوانی

قورئانیش هەردووک ڕایان گوتوون ـ وێچووترە ، چونکە ڕاناو واچاکە بۆ نیزیکترین باسکراو ( أقرب مذکور ) بگەڕێتەوە ، دیسان ( تعزیر و توقیر ) یش زیاتر لە پێغەمبەر دەوەشێنەوە نەک لەخودا ، ئەمە هەموو لەلایەکەوە ، لەلایەکی دیکەشەوە ، هەمان مەبەست لە سوورەتی ( الأعراف ) یش دا بۆ پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام بەکارهێنراوە ، وەک دەفەرموێ : ( الذین یتبعون الرسول النبی الأمي ..... فالذین آمنوا به وعزروه ونصروه ..)/١٥٦.

بەهەرحاڵ ، وەک دەبینین خوای کاربەجێ داوا لە مسوڵمانان دەکات کە پشتگیری پێغەمبەرەکەی بکەن و ڕێزی بگرن ، دەجا گومانیشی تێدا نیە کە ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی یادی لەدایک بوونی‌یەوە لەسنووری شەرعدا هۆیەکی یەکجار کاریگەرو چاکە بۆ پشتگیری کردنی ئەو زاتە پایەبەرزەو ڕێزلێنانی ، وەک دواتر ڕوونی دەکەینەوە .

دووەم : خوای میهرەبان و چاکەکار فەرموویەتی :( .. ورفعنا لک ذکرک .. ) الأنشراح / ٤ . واتە : .. وە ئایا ناو ـ و دەنگ و باس ـ تمان بۆ بەرز نەکردیەوە .. ؟!
کەواتە : نەک هەر بێ شەرعیو خراپ نیە ، بگرە زۆر شتێکی چاک و پەسندە کە ئێمەش چاو لەخوای خۆمان بکەین و هەوڵ بدەین لەڕێ ی ئاهەنگ گێڕانی ناوبراوو هەر ڕێ یەکی دیکەی شەرعی‌یەوە ناوو ناوبانگی پێغەمبەرمان بەرز بکەینەوەو ، زیاتر خەت و ڕێبازی ئەو سەروەرە بۆ خەڵکی ڕوون بکەینەوە !

سێیەم : خوای بێ وێنە فەرموویەتی :( قال عیسی ابن مریم

اللهم ربنا أُنزل علينا مائدة مِنَ السماء تكون لنا عيدا لِأُولنا وآخرنا .. ) المائدة / ١١٤ ، واته :
عیسای کوڕی مەریەم فەرمووی : ئەی خوای پەروەردگارمان سینییە (١) خواردنێکمان لەئاسمانەوە بۆبنێرە خوارێ ، کە ببێتە - مایەی - جێژن - و شادی - بۆ پێشینانمان و پاشینانمان ..
( أبوجعفر الطبري ) لە تەفسیری ڕستەی ( تکون لنا عیدا ) دا فەرموویەتی :( واتە : ڕۆژی هاتنەخوارەوەی - ئەو سینییە - دەکەینە جەژن و بەگەورەی دەگریین ، وە ئەوانەی دوای ئێمەش بەگەورەی دەگرن ) .(٢)
کەواتە :
ئایا ئەگەر پێغەمبەرێکی پایەبەرزی وەک عیسا علیه السلام بەبۆنەی هاتنەخوارەوەی سینییە خواردنێکەوە کە دەبێتە موعجیزەو مایەی دڵ دامەزرانی شوێن کەوتووانی ، جێژنێک بۆخۆی و بۆ ئەوانەی لەدوایەوە دێن سازبکات !
هیچ بێ شەرعیو خراپەیەکی تێدایە کە ئێمەی مسوڵمانیش بەبۆنەی لەدایک بوونی هەڵبژاردەی مرۆڤایەتیو سەروەری پێغەمبەرانەوە علیه الصلاة والسلام بیکەینە جێژن و ڕۆژی کەیف و شادی و ئاهەنگ گێڕان و خواردن دان بە هەزاران و شیرینی بەشینەوەو وتاردان و .. هتد ؟! مەگەر

---

(١) ( راغب الاصفهاني ) دەربارەی وشەی ( المائدة ) فەرموویەتی :( والمائدة الطبق الذي عليه الطعام ) .
بڕوانە ( مفردات ألفاظ القرآن ) ص ٤٧٧ .
(٢) بڕوانە ( مختصر تفسير الطبري ) ص ١٣٩ .

هاتنەخوارەوەی سینییە خواردنێک گرنگترە لە لەدایک بوونی پێغەمبەرێکی وەک ( محمد ) علیه الصلاة والسلام ؟!

چوارەم : لە کتێبی ( صحیح البخاري ) دا هاتوە ، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وآله وسلم دوای کۆچکردنی لە شاری مەککەوە بۆ شاری مەدینە ، لەمانگی موحەرەم دا گوێ بیست بوو کە جوولەکەکان لەرۆژی دەیەمی مانگدا بەرۆژوو دەبن ، ئەویش پرسیاری لێ کردن دەربارەی هۆی رۆژوو گرتنیان ، لەوەڵام دا گوتیان :

بەو بونەیەوە بەرۆژو دەبین کە پێغەمبەرمان مووسا علیه الصلاة والسلام لەو رۆژەدا لەچەنگ فیرعەون رزگاری بووە ، ئەویش فەرمووی :

ئێمە لەپێشترین لە مووسا لە ئێوە ، وە ئێمە شایستەترین بەو رۆژە .

جا زانایانی ئیسلام لەم فەرموودەیەیان فامیوەتەوە کە شتێکی چاکە مسوڵمانان لەکاتی پەیدابوونی نازو نیعمەت و خێروخۆشی‌یەک دا شادی و خۆشحاڵی دەربىرن ، ئنجا بێگومان گەورەترین نیعمەت و چاکەی خوداش بەسەر ئێمەوە لەدایک بوون و پەیدابوونی پێغەمبەرمان ( محمد ) ە علیه مِنَ الله أفضل الصلوات وأتم التسلیمات .

مادام وابێ شتێکی شەرعی‌و چاکە کە لە شەوو رۆژی لەدایک بوونی ی یان مانگی لەدایک بوونی‌دا مسوڵمانان کەیف و شادی بنوێنن و بیکەنە ئاهەنگ و جێژن .

هەڵبەتە دەتوانین بەڵگەی دیکەش لەوبارەوە بێنینەوە ، بەڵام هەم دەرفەت کەمەو هەم ئەوەندەش کە باسکرا بۆ

ڕوونكردنەوەو سەلماندنی مەبەست بەسە .

ئێستاش پاش ئەم ڕێ خۆشكردنە درێژخایەنە ، كە زۆر شتی لەئەسڵی مەبەستیش تێدابوون ، دەچینە سەر توێژینەوەی هەندێك لەو باسانەی كە بەپێویستیان دەزانم دەربارەی بابەتی ناوبراو بخرێنەڕوو :

## مەبەست لە داهێنانی بیرەوەری لەدایك بوونی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم چییە؟!

شتێكی ئاشكراو ڕوونە كە مەبەست و ئامانجی یادكردنەوەو بیرەوەری هەر ناوداروپێشەوایەك ئەوەیە كە خەڵكی خەت و ڕێبازی ئەو كەسەیان هەمیشە لەبەرچاو بێ و، مردن و لەدنیا دەرچوونی نەبێتە هۆی فەرامۆشكرانو كوێربوونەوەی ڕێ و شوێنەكەی .

مادام وابێ ( مەبەست لە داهێنانی بیرەوەری لەدایكبوونی پێغەمبەر ) یش علیه الصلاة والسلام ئەوەیە كە گوتراو، كاتی خۆی كە زانایانی بیرتیژو زەین فراوان و دڵ بێدارو بەمشوور دایان هێناوە ، ئەو مەبەستەیان تێدا ڕەچاوكردوە ، ئنجا كە دواتر مەسەلەكە شێوێنراوە یاخود هەر ئاوەژووش كراوەتەوە ، ئەوە شێوینران و ئاوەژوو كرانەوەی ( ڕاستی ) یەك هیچ لە نرخ و بایەخی ئەو ڕاستییە دانالەنگێنێ .

بەڵێ خوێنەری سەنگین !

ئامانجو مەبەستی زاناو پێشەوایانی ئیسلام لە داهێنان و ڕەواج پێدانی بیرەوەری لەدایک بوونی پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام ئەوەبووە ، کە خەڵکی بەو هۆیەوە هان بدەن و وا لێ بکەن کە خەت و ڕێبازو ڕێ و شوێن و ئاکارو ڕەفتاری بەرزو پەسندی پێغەمبەرەکەیان لەبیرنەچێتەوەو ، بزانن ئەو پێغەمبەرو ڕابەرە ڕەندو پەسندەی کە خۆیان بە شوێن کەوتوو و وەفاداری لەقەڵەم دەدەن ، کێ بووەو ، چۆن بووەو ، چی کردوەو ، بۆچی ژیاوەو ، چۆن ژیاوەو ، لە چ ڕێ یەکدا مردوەو ، لە مەککەدا چەند قۆناغی تێکوشان ( جهاد ) ی بڕین و ، چ شێوازێکی بەکارهێناو ، حیکمەتی ئەو قۆناغانەو ئەو جۆرە شێوازە چ بوو و ، کێ دۆستایەتی دەکردو بڕوای پێ دێناو ، کێ دوژمنایەتی دەکردو بەخوێنی سەری تینوو بوو و لەبەرچی ؟!

وە دوایی پاش (١٣) ساڵ بانگەوازی و خەڵک تێگەیاندن و بێدارکردنەوە ، بۆچی مەککەی پیرۆزی بەجێ هێشت و بەرەو شاری ( یثرب ) کۆچی کردو ، چۆن کۆچی کردو ، کە گەیشتە شاری ( یثرب ) یەکەم ئیشی چ بوو و ، لە شاری[1] ( مدینة ) لەماوەی (١٠) ساڵاندا چۆنی گوزەراندو چەند جەنگی کردن و چۆن لەجەنگی بەدرو زۆربەی جەنگەکانی دیکەدا سەرکەوت و ، هۆی تێشکانی سوپایەکەی لەکۆتایی جەنگی ئوحودو سەرەتای جەنگی حونەین دا چ بوو و .. هتد ؟!

---

(١) شاری ( مەدینە ) پێش کۆچ بۆکردنی پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام ناوی ( یثرب ) بوو ، کە کۆچی کرد ناوەکەی گۆڕی بە ( مدینة ) .

بەواتایەکی دیکە مەبەست لە ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی یادکردنەوەی ڕۆژی لەدایک بوونی پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام ئەوەیە ، کە مسوڵمانانی شوێن کەوتووی تەرجەمەو تەفسیرێکی ڕاست و دروستی کردەیی ( فعلي ) و زیندووی قورئان لە ژیانی پێغەمبەرەکەیان دا ببینن .

ڕوونتر بڵێم :

بۆئەوەی مسوڵمانان بزانن بیروباوەڕو تێڕوانین و تەقواو عیبادەت و جەنگ و سیاسەت و ڕەوشت و ئەدەب و وردو درشتی پێشەواو ڕابەرەکەیان چۆن بووە ، تاکو کە زانیان پێغەمبەرەکەیان کێ بووەو چۆن بووە ، بیکەنە پێشەواو چاوساغ و سەرمەشقی ژیانیان ، چونکە ئینسان هەتا کەسێک نەناسێ ناتوانێ شوێنی بکەوێ و بیکاتە چاوساغ و ڕابەرو سەرمەشقی خۆی .

## -٢-

## چەند ساڵە ، گەلی کورد چۆن ئاهەنگی بیرەوەری ناوبراوی گێراوە ؟!

خوێنەری خۆشەویستم !

ئەوەی کە بەکورتی لەباسی یەکەمدا گوتم ئامانج و مەبەستی داهێنرانی بیرەوەری و ئاهەنگی یادی لەدایک بوونی پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام بوو ، بەڵام سەد داخ و خەفەت ، هەزار حەیف و مەخابن ، کە زۆر لەمێژە لە جیهانی ئیسلامیدا

بەگشتیو لەنێو گەلی کوردی مسوڵمانمان دا بەتایبەتی ، بیرەوەری لەدایک بوونی پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام ، نەک هەر ئەو ئامانجو مەبەستەی پێ نەهێنراوەتەدی کە گوتمان ـ مەگەر بەدەگمەن ـ بەڵکو ئەو بیرەوەری یە مەزنە بەجۆرێک سازکراوەو بەشێوەیەک بەرێوەبراوە ، کە لەجیاتی خەڵک گێڕانەوە بەرەو ئیسلام ، لەئیسلامی هەڵگێڕاونەوەو ، لەباتی بێدارکردنەوەیان خەوی لێ کەواندوون و ، لەبری بەرزکردنەوەی ناوو ناوبانگی پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام لەبەرچاوانی خستوەو ، لەجێی رێزلێنان و قەدرگرتن گەلێکیشی سووک کردوەو ، لەجیاتی شیرین کردن و خۆشەویست کردنی ، بۆتە هۆی تاڵ کردن و بوغزێنرانیو .. هتد .

ڕەنگە زۆر کەس بپرسێ ، ئاخر بۆ ؟! چۆن ؟! لەبەرچی ؟! کەنگێ ؟! کوا ؟!

ئێمەش لەوەڵامی ئەم پرسیارانەدا دەڵێین :

ئەگەر بمانەوێ بەتێروتەسەلی و خەست وخۆڵی وەڵامێکی موستەهەقی ئەو ( بۆو چۆن و لەبەرچیو کەنگێو کوا ) یانە بدەینەوە ، هەم ئێمەش لەنووسینێو هەم خوێنەریش لە خوێندنەوێ ماندوودەبین و بڕستمان لێ دەبڕێ ، بەڵام بەهەر حاڵ لوێچ نموونەی تەغارێ و مست نموونەی خەروارێ یە ، ئێمەش لە تەغارو جەوالی ئەو وەڵامو دەنگ و باسە دوورو درێژە لوێچێک یان مستێک بۆ نموونە دەخەینەبەرچاوان و بابای ژیریش بەکەمی لەزۆری دەگاتو ، شتێکی لێ بەشتێک هەر دەکات !!

شتێکی ڕوون و بێ پێچوپەنایە کە کەسێک بیەوێ دەربارەی

ژیانی پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام بدوێ و بەخەڵکی بناسێنێ، حەتمەن دەبێ پەنا بەرێتە بەر دوو سەرچاوە ڕوون و بێگەردە ـ کەی ئیسلام ( قوڕئان و سوننەت ) ، بەڵام خوێنەری سەنگین! دەزانی لە کوردستانی نیشتمانی گەلی کوردی مسوڵماندا ، کە پارچەیەکە لە سەرزەمینی نیشتمانی ئیسلامیو ، خەڵکەکەشی نموونەیەکە لە ئۆممەتی ئیسلامی ، سەرچاوەو کتێبی ئاهەنگ گێڕان و بیرەوەری لەدایک بوونی پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام چی بووە ؟!

نیزیکەی نیو سەدە (٥٠) ساڵ دەبێ زۆربەی هەرەزۆری زاناو چاوساغانی ئایین و جێگرو میراتگرانی ! پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام تاقە کتێب و سەرچاوەی بڕوا پێکراویان بۆ یادکردنەوەی لەدایک بوونی پێغەمبەر صلی الله علیە وآلە وسلم کتێبۆلکەیەکی چەند لاپەڕەییە بەناوی ( مەولوودنامەی پێغەمبەر ) علیە الصلاة والسلام ، کە لەهەندێک ناوچان مەلاو فەقێ پێی دەڵێن :

( کتێبی پلاوان !! ) .(1)

ئنجا ئایا کتێبی پلاوان چیەو چۆنە ؟! ئەوە لەباسی داهاتوودا ڕوونی دەکەینەوە .

---

(1) بۆیە ئەو ناوەیان لێ ناوە ، چونکە زۆرکەس تاقە ئامانجو مەبەستی یان ئامانجی هەرەگەورەی لە خوێندنەوەی ئەو کتێبەدا کە گوتمان ئاهەنگی گۆڕینی پێ دەگێڕێ ، پلاو خواردن و سمێڵ ماڵینەوەیەو هیچی دی ! کتێبی پلاوانیش ناوی نووسەرەکەی لەسەر نیە ، بەڵام ( مەلا علاء الدین سجادي) لەکتێبی( دەقەکانی ئەدەبی کوردی )دا لەلاپەڕە (١٧٩، ١٨٠) نووسیویەتی : نووسەرەکەی ( شێخ حسینی قازی ) یەو ، بۆ جاری یەکەم لەلایەن مەلا عەبدولکەریمی حاجی ئەحمەدی هەکزیەوە ، لەسالی(١٩٣٥) لە چاپخانەی ( نجاح ) لە بەغدا چاپ کراوە .

-٣-

## هەڵتەکاندن و لەبێژینگدانی «کتێبی مەولوودنامە»

جا خوێنەری بەڕێز ئێستاش ئەتۆو گەشتێکی خێرا بەنێو باغی لالەزاری پەڵەداری نالەباری پڕ ئەفسانەی کتێبی ( مەولوودنامە ) دا ، [1] کە ناوی پڕبەپێست و ڕاستەقینەی ( کتێبی پڵاوان ) ە !!

جا ئێمە لە حەوت خاڵان دا کتێبی گۆڕین لەبێژینگ دەدەین :

خاڵی یەکەم : چەند ڕیوایەتێکی بێ بنچینەو درۆ ( مەولوودنامەی ناوبراو ) لەسەرەتاوە چەند قسەیەکی هەڵبەستراوو درۆ پاڵدەداتە لای چەند زاتێکی گەورە لە برادەرانی پێغەمبەرو علیە الصلاة والسلام زاناو ناودارانی ئیسلام ، بۆ وێنە چوار جێنشینەکانی پێغەمبەرو ( شێخ معروف الکرخي ) و ( فخر الدین الرازي ) ، کە گوایە فەرموویانە هەرکەسێک تەنیا درەمێک خەرج بکا بۆ ئاهەنگی لەدایک بوونی پێغەمبەر صلی اللە علیە وآلە وسلم ئەوە

---

(١) ئەو ( مەولوودنامە ) بە یەکەمین ( مەولوودنامە ) ی ڕەواج پێدراوە ، دەنا سێ چوارێکی دیکەشم پێ شک دێن ، بۆ نموونە مەولوودنامەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس و مەولوودنامەی شێخ محمدی خاڵ .

بەڵام پیاو هەقێ بڵێ مەولوودنامەکەی شێخ محمدی خاڵ تا ڕاددەیەک چاکەو نەختێک باسی ژیانی پێغەمبەر دەکات ، علیە الصلاة والسلام !!

بەڕەی خۆی لەئاوێ دەرێناوەو بۆخۆی بەپێڵاوەوەو حـــەوت پشتیشی لەگەڵ دەچنە بەهەشتێ ، کەواتە نوێـــژو ڕۆژوو و زەکات و حەج و فەرمان بەچاکە کردن و ڕێگرتن لەخراپـــەو جەنگ و جیهادو لەسەر چەوساوان کردنەوەو بەگژزۆرداران دا چوون و .. هتد چش و سفری دوای فاریزەن !!

هەڵبەتە ئەو ڕیوایەتە هەڵبەستراوو درۆو دەلەســـە شاخ و باڵدارانە ، گەورەترین دەوریان هەبووە لـــە پاڵدانەوەو پشتێند لێ کردنەوەو ساردەپشت بوونی چەنـدان کەسی بێ ئاگا ، لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خـــواو پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام ، چونکە بەدەردی کابـــرا گوتی ( سەرت نایەشێ بۆ سێتای لێ داڵێنی ! ) مادام نەک بە ( مەولوود ) خوێندنەوەیەک ، بەدرەمێک بەمرادبگەی و ئەبووبەکری صیددیقی ڕاستگۆو شێخ مەعرووفی کەرخـــی دنیابەکەمگرو پارێزکار مزگێنی لەدۆزەخ قوتاربـــوون و بەبەهەشت شادبوونت پێ بدەن ، چ پێویست دەکات نەفســی خۆت ئەزیەت بدەی و کارو فەرمانەکانی بەرنامەی خـــوا جێ بەجێ بکەی !

ئەدی ئەتۆ ئامانجت ئەوە نیە بەبێ دەردی سەری بچیـــە بەهەشتێ ، دە ( مەولوود ) ێکی بکەو بۆخۆت بێ خـــەم و خاترجەم بەو دەستی لێ وەبن سەری بدە !! (1)

---

(1) ئەمەش دەقی ئەو قسانەیە کە کتێبی ناوبراو بەدرۆ لـــە چوار خەلیفەکان و شێخ مەعرووفی کەرخی و فەخرەددینـــی ڕازی یەوە نەقڵیان دەکات .
دەڵێ :
( یاری غار أفضلي چهار یار خلیفەی أول أعلم وأكمل رفیقي شفیق أبوبكر الصدیق فەرموویەتی هرکەسێکی خرج بکا درهمێک

بۆ مولودی أفضلي مخلوقات بە تحقيق رفيقي منە لەسەر
کانیو کانیاوی سلسبيل و رحيق ) !!

منيش دەڵێم :

بەختت سوارە ئەی کابرای کافرو زەندیق
بەیەک درەم دەبیە هاوەڵی أبوبکر الصديق !

ئنجا دەڵێ :

( إمامی همام ، قدوة الإسلام فاروقی أعظم ، خليفەی دووەم ، زينەتی منبرو محراب أعدلی أصحاب عمر بن الخطاب رضي الله تعالی عنه ، فرمويەتی ئەوکەسێکی بکا تعظيمی مولودی حضرت رسول رب أرباب ، کأنه زندوی کرديتەوە دينی إسلامو حديث و کتاب ) .

منيش دەڵێم :

کەسێک لەوجۆرە قسانە رادەمێنی و هەست رادەگری
مەردی دەکەم عەقڵی هەبێو بۆ حاڵی ئیسلام نەگری

ئنجا دەڵێ :

( إمامی زمان منبعی حيا و عرفان خليفەی سێ هم ذي النورين عثمان بن عفان فرمويەتی أو شخصێک صرف بکا درهمێکی لە خوێندنی مولودی پێغمبر صلی الله عليه وسلم ( من نزل عليه القرآن ) کأنه شهيدي ( بدرو حنين ) ە بە إيمان و بە إيقان ) .

منيش دەڵێم :

خۆشی لەخۆتان زۆردارانی چەنگ بەخوێن
بەدرەمێک دەچنە ڕیزی شەهیدانی بەدرو حونێن !

ئنجا دەڵێ :

( أسد الله الغالب مظهر الغرائب والعجائب خليفەی چوارم علی بن أبی طالب رضي الله عنه فرمويەتی کەسێک ببێتە باعثي خوێندنی مولودي حضرت رسولی ملک الوهاب ، ظفر بە إيمان دەبا ، بۆ وی دەبێ راغب و طالب ) .

منيش دەڵێم :

بارەکەڵڵا خاوەنی مەولوودنامە
خۆزگە گوتبات سەرچاوەی قسانت کامە ؟

ئنجا دەڵێ :

( شێخ معروفي کرخي ) ... فرمويەتی ئەوکەسێک دروست بکات

چێشت و نان بانگ بکا مسوڵمانان ... مزین بێت و منـــور مجمل بێت و معطر بۆ تعظیمی سیدی سروەر بە ایمانـــــی سلیم لەدنیا دەچێتەدەر ... لە محشری هیچ کۆسپـــــەی نایەتەبەر . لەسەر پردی صراط نابینێ هیچ خوف و خطر ...)

منیش دەڵێم :

کوا مزگێنی هۆ جەردەی پیاوکوژی بەدفـــــەڕ
بەمەولوودێک بەڕەت لەئاوێ دێنیـــــــەدەرێ !!

دوایی دەڵێ :

(رئیس العلمای عراق و حجازی إمام فخري رازي خوای لێبێ رازی فرمویەتی اگر بخوێندرێ مولودی چاترینێ و أفضلـــی مخلوقات لە چێشتێک لە مأکولات تێیدا ظاهر دەبێ برکات لەزگی إنسان دا دەستدەکاتە إضطراب و حرکات تا بـــۆ ئەوکەسەی خواردویە مغفرت دێ بەخەڵات ...)
(لاپەڕە / ٢ ، ٤ ، ٥ ) .

منیش دەڵێم :

سبحان الله لە باپایەک کە لە خاڵی بوونی دیـــن دا عەقڵی دەعەمەل نایەنێو سەر لەخۆو خەڵکی تێک دەدات

خاڵی دووەم : چەند بەسەرهاتێکی ئەفسانەیی و دژ بەئیسلام

جا ئەوەی کارەکەی خراپترو قورەکەی خەستتر کردوە ئەوەیە کە مەولوودنامەی گۆرین ، هەر بەوەندەی دڵی دانەمرکاوە کە درۆو دەلەسەی بێ بنچینەو ناقۆڵا بەزمانی ناودارانی ئیسلامەوە هەڵبەستێ و ، قسەیان دەربارەی شتێک پێ بکات کە چەند سەدە پاش وان پەیدا بووە ، بەڵکو سەرباری ئەوەش چەند بەسەرهاتێکی درۆو بێ بنچینەی گێراوەتەوە کە دەوری وانیش لە هەڵخزاندن و پشتێند لێ کردنەوەو ساردەپشت کردنی خەڵکی سەبارەت بە جێبەجێ کردنی ئەرک و فەرمانەکانی ئایین ، ئەگەر پتر نەبووبێ کەمتر نەبووە لە ئی ڕیوایەتە هەڵبەستراوەکان ، بۆ وێنە :

بەسەرهاتێک دەگێڕێتەوە کە گوایە لەشاری بەصرا یەوە ڕووی داوە ، نێوەڕۆکەکەی ئەمەیە کە ئێستا دەینووسم :

دەگێڕنەوە لەشاری بەصرا کابرایەک هەبوو هەتا بڵێی چەتوون و نەگبەت و بێ خێر ، نوێژنەکەر ، خوانەناس ، لامەزەب !!

هێندە بەدفەڕو نەگریس و پیس بوو کە مرد خەڵکی لە گۆڕستانی مسوڵمانان نەیان شاردەوەو فڕێ یان دایە سەر زبڵدان .

شەوێ خەڵکی لەخەونێدا دیتیان ئەوە لەنێو باغ و کۆشک و تەلاری بەهەشتێدایەو دەستە ملانی حۆرییانە !!
لێیان پرسی : کابرا ئەوە بەچی ڕزگارت بوو و چۆن بەو پلەوپایە بەرزە گەیشتی ؟!
لەوەڵامدا گوتی : من هەموو ساڵێ بەبۆنەی یادی لەدایک بوونی پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وآله وصحبه وسلم ( مولود )ێکم

دەکرد !! (1)

کەواتە :

هیچ کەس بۆی نیە بڵێ : فلان زۆرداری خوانەناسی خۆبەخوازان بەئاگری دۆزەخێ دەسووتێ مادام هەموو ساڵێ ( مولود ) یەکێ بکات !

وە هیچ کەس بۆی نیە بڵێ : فلان کەسی داوێن پیسی پیاوکوژی ڕێگری شەراب خۆری قومارچی ، دەچێتە دۆزەخێ و ڕێی چوونە بەهەشتێی نیە ، مادام جاروبار مەولوودی خوێندبێتەوە !

وە هیچ کەس بۆی نیە بڵێ : بەپێی فلان ئایەت و فەرموودە باباى نوێژنەکەرو ڕۆژوونەگرو زەکاتنەدەرو حەج نەکەرو.. هتد ناچێتە بەهەشتێ ، مادام مەولوودێکی لە لیستەی کردەوان دا هەبێ !

بەکورتی و بەکوردی ئەم بەسەرهاتە پێمان دەڵێ ( مولود ) خوێندنەوە ، پاساپۆرتێکە هەرکەسێک پێی بێ ئەگەر خراپترین و بێ دین ترین کەسیش بێ ، هیچ کەس ناتوانێ

---

(1) بەسەرهاتەکە ئاوا دەست پێ دەکات :
( لەشاری بەصرە جوانێک هەبوو پیس و پەلید لە فاسقی دا شاگردی ئەو بوو یزید .... هەتا دەڵێ : وەختێ کە مرد لەبر خراپیان فرەیان دا سەرگوفکان . نەیان بردە سەر قبران .... دوایی دەڵێ : لەخەویان دیت اول شەو لەسر تخت بهشتێ دانیشتیە روی وەک مانگ دەدا پرتەو پێیان گوت اُتو لە دنیا زۆر فاسق بوی و احمق بەچی شادبووی بە حورو قصورو لباسی سندس و استبرق؟گوتی بەسبب تعظیمی مولودی ئەو حضرەتەی کە بە اشارەتی ئەنگوستی مانگی دەکرد شەق ).
بڕوانە لاپەڕە ( ٧ ، ٨ ) .

ڕێ ی چوونە بەهەشتێی لێ بگرێ ! (١)

هەڵبەتە پەرێزو شوێنەوارى بەدو شوومى ئەو مەبەستە هەڵانەى کە لەم بەسەرهاتەش دەفامرێنەوە ، زۆر بەڕوونى لەژیانى گەلەکەمان داو هەڵس وکەوتى ڕۆژانەیان دا دەبینرێن و گەلێک گەوجو نەفامو تێ نەگەیشتووان دەبینین ئیمانیان بە نیسکێ سپاردوەو ، بەهەویا ( مولود ) ێ لێی گەڕاون و دەستیان بەخۆدا بەرداونەوەو ، پشتێندیان لێ کردۆتەوەو برۆ بەخێرهاتى !!

خاڵى سێ یەم : مەولوودى پێغەمبەر کراوەتە قەڵغان و بەلاگێڕەوەى سەرى زۆرداران

کتێبى گۆرین بەسەرهاتێکی دیکەی ئەفسانەیی گێڕاوەتەوە ، کە ئەگەر ئەو ئەفسانەیە ڕاست بێ ، دەبێ بڵێین :(مارکس ) ڕاستى گوتوە کە دەڵێ ( ئایین تریاکى گەلانە ) و ( چەکى دەستى چینى بۆرژواو سەرمایەدارە بۆ لێدانى چینى رەنج دەرو چەوساوە .) !!
چونکە کاکڵى ئەو بەسەرهاتە ئەوەیە کە کاربەدەستێکی

---

(١) بەڵێ ئەگەر کەسێک ( یەزیدى کوڕى موعاویە ) کە حوسێنى کوڕى عەلى ( رضي الله عنهما ) شەهید کرد ، بەشاگردى بشێ لەخراپیو پیسیدا بەهۆى ( مولود ) خوێندنەوەوە بچێتە بەهەشتێ ، مانای وایە ( مولود ) خوێندنەوە هەموو شتێکەو ئینسان کە ئەوى هەبوو حەوجێی هیچى دیکە نیە ، چونکە ئەگەر زۆر پیس بێ هەر دەتوانێ وەک یەزیدى بێ ، بەلام ( مولود ) خوێندنەوە ئى واى قوتارکردوە کە لە یەزیدیش خراپتربووە !!.

زۆر ستەمکارو چەوسێنەرو غەددار هەبووە ، بەڵام هەموو ساڵێ ( مولود ) ی کردوە !

ڕۆژێکی ئامۆزایەکی خۆی بەخەنجەرەوە لەسەر سەری ڕادەوەستێو پێی دەڵێ کێ ڕزگارت دەکات لەدەستم ؟!
ئێستا سەرت دەبڕم بەخەنجەر ! ئەویش خواو ڕاستان بەزاری دا دێ و دەڵێ ( قوتارم دەکات مەولوودی پێغەمبەر ) !! ( علیه الصلاة والسلام ) .

ئیدی دەستبەجێ ئەو قسەیە دەبێتە تەلسمێک و جادووی ئامۆزایەکەی پێ هەڵدەوەشێنێتەوەو خشتێک لەدیواری دەردەپەڕێ و وەسەر دڵی ئامۆزایەکەی دەکەوێ و جێ بەجێ فەراقی ڕەشی لێ دەبڕێ ، جا ئەوجار لەئاسمانەوە بانگی کابرای ستەمکارو زۆردارو غەددار دەکرێ : بۆ خاتری مەولوودی پێغەمبەر ڕزگارمان کردی ، ئەگەر تۆ زیادبکەی ئێمەش زیاد دەکەین !!

ئەمە نێوەڕۆکی ئەو بەسەرهاتە ناماقووڵ و لەگەڵ ئیسلامدا نەگونجاوە بوو کە کتێبی ناوبراو لە لاپەڕە (٩٠٨)دا نووسیویەتی !!
دەجا خوێنەری بەڕێز !

وەرە مەردت دەکەم چاک سەرنجی ئەم بەسەرهاتە بدەو بۆحاڵی مسوڵمانان مەگریە !

پێغەمبەرێک لەهەموو ژیانیدا دانووی لەگەڵ زۆردارو چەوسێنەرانی خۆبەزلگرو خۆسەپێن دا نەکوڵی بن و ، هەموو ژیانی تەرخان کردبێ بۆ ڕزگارکردنی چەوساوان و لەنێوبردن و خەساندن و ڕەتاندنی زۆرداران ، کەچی کۆلکە مەلایەکی نەفامو بێ هوش بێنێ بەبەسەرهاتێکی درۆو

هەڵبەستراو ، یادی لەدایک بوونی ئەو پێغەمبەرە هەزاردۆست و بەخوێنی زۆرداران تینووە ، بکاتە دوژمنی هەزارو چەوساوانی شۆڕشگێڕو ڕاپەڕیوو دۆست و بەلاگێڕەوەو قەڵغانی سەر سەری کافرو خۆبەخوازانانی دنیاخۆرو بەزەبرو زۆر !!

دەجا وەرە خەڵکێک ئاوا باسی پێغەمبەری بۆ بکرێ و ئاوا ئاهەنگی یادی لەدایک بوونی پێغەمبەری بۆ بگێڕدرێ و ، جا با ئاوا سەری لێ نەشێوێ و ئاوا پەرتەوازەو لەت وپەت و ژێردەستە نەبێ و ، ئاوا وەسەر جاش و ڕێگرو داوێن پیس و پیاوکوژو مەیخۆرەوەو قومارچیو ڕێچکەپەرستان نەگەڕێ !!

لەڕاستیدا هیچ جێی سەرسوورمان نییە کە ئەو خەڵکە بەناومسوڵمانە ئاوای لێ هاتوە ، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەوە سەیر دەبوو کە ئەجۆرە کتێب و نووسراوانەی بەناوی ئیسلامەوە بۆ بخوێندرێنەوەو ئاوای لێ نەیەت !!.

خاڵی چوارەم : ترەکەڵەکەی گا و ماسییان

کتێبی گۆڕین هەرچەندە بەحساب باسی لەدایک بوونی پێغەمبەر صلی الله علیه وآله وسلم دەکات ، بەلام ( لەهەموو دیزان بۆتە ئەسکوێ ) و گەلێک باس و خواسی جۆراوجۆری دیکەشی تێدان کە گەورەترین دەوریان بووە لە ناشیرین کردن و لەبەرچاوان بێزاندنی ئیسلام و قورئان و پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام ، بۆ وێنە :( کتێبی پلاوان ) ئاوا باسی حاڵ و باڵی دنیاو چۆنیەتی ڕاوەستانی خڕۆکەی زەوی دەکات : (١)

---

(١) بڕوانە کتێبی ناوبراو لاپەڕە (٣٧) ، هەڵبەتە ئەو

( ارض لەسر بەردیە بەرد لەسر گایە ، گا لەسر ماسی یە ، ماسی لەسر ئاوی یە ، ئاو لەسر بایە ، با لەسر هوایە ، هوا لەسر تاریکی ڕۆندرایە ، لەژێر تاریکی کس نازانێ چی باسەو چی هەرایە . ) !!

دەجا وەرە کەسێک شارەزای ئیسلام نەبێو ئاگای لە ئایەتی ( وکلٌ فيِ فلك يسبحون ) ی [1] سوورەتی ( يس ) نەبێ و ، ئەم قسانەش بەشتێکی ئیسلامی بزانێو ، پێی وابێ لە قورئان و سوننەت وەرگیراون ، جا با هەتا پێی پێوەن ، لە ئیسلامی واو قورئان و سوننەتی ئەوتۆ ڕانەکات ، کە ( ترەکەڵەکە ) ی هێندە عەجایب سازدەکەن !!

---

(١) واتە : هەرکام لە ڕۆژوو مانگ و زەوی ـ و باقی خرۆکەو ئەستێرەکانی دیکەش ـ لە سووڕگەیەک دا مەلە دەکەن .

---

......................................

کتێبە تاقە کتێبێک نیە کە ئەفسانەو درۆو دەلەسەی زۆری بەناوی ئایینەوە بلاوکردۆتەوە ، بەڵکو ئی دیکەش زۆرن .
بۆ نموونە :
١ـ( میعراج نامە ) ی ( سلام حيدري ) .
٢ـ( حیدر نامە ) .
٣ـ( غەزای بەدرو حونەین ) .
٤ـ( کوردستان و ئایینی ئیسلام ) .
٥ـ( یوسف و زلێخا ) .
٦ـ( فەتحی قەلای خەیبەر ) ... هتد .

خالّی پێنجەم : دەیان دەریاو پەردەو هەزار و هوزیای خەیالّکرد

ئنجا سەربارەی هەموو ئەمان کتێبی گۆرین هەر بەوەندەوە نەوەستاوە کە بیری تیژو بڕندەو قەڵەمی مووقەلّێشی خۆی بەس لەم جیهانە بەرهەست ( محسوس ) ەدا بخاتەکار ، بەڵکو نێو نێوە دەمی لە جیهانی پەنهانی ئەودیو سروشت ( میتافیزیک ــ ماوراء الطبیعة ) یش وەرداوە ، لەوێش دا ئەسپی ئەفسانەیی خۆی تاوداوە !

بۆ وێنە :

کە دێتەسەر باسی پەیدابوونی گیان ( روح ) ی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام ، بەڕاشکاوی وەک کتێب گرەوەو فالچی ــ یەکی کارامە دەڵێ : گیانی پێغەمبەر صلی الله علیه وآله وصحبه وسلم ئەوەندە هەزار ساڵە لە فلان دەزیستادا و لەپشت فلان پەردەوە فلان جۆرە زیکرەی دەکردو لە فیسار دەریادا و لەودیو فیسار پەردەوە فیسار جۆرو .. وە هەروەها !!

جا حەیفێ بابایەکی لەئیسلام شارەزا و بەقورئان و سوننەت ئاشنای لێ هەڵنەکەوتوە توند بەرۆکی بگرێ‌و بلێ : ئاخر کابرا چ خوا بەرداری ئەو هەموو دیوو دەلەساتە بەزمانی پێغەمبەرەوە هەڵبەستیو ئەو هەموو بوختانانەی پێوە بکەی ، دەکوا ئەو هەواڵ و دەنگ و باس و شارەزاییە ــ یانەت لەکام ئایەتی قورئان و کیهە فەرموودەی پێغەمبەر وەرگرتوون و دەرهێناون و ، ئەو گەوهەرو مرواری یانەت لە چ دەریایەک وەدەستکەوتوون و چۆنت بەرهەمهێناون ؟!(1)

---

(1) بۆ چۆنیەتی باسکرانی ئەو پەردەو دەریا خەیالّیانە بڕوانە لاپەرە (19 ــ 22 ) ی کتێبی گۆرین .

مەگەر نەت بیستوە کە پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی : ( مَنْ كذب عليَّ متعمدا فليتبوَّأ مقعده مِنَ النار ) رواه الترمذي . واتە :
هەرکەسێک بەئەنقەست درۆم بەزمانی‌یەوە هەڵبەستێ ، با جێی خۆی لە ئاگری ـ ی دۆزەخێ ـ دا هەڵبگرێ ؟!

خاڵی شەشەم : درۆهەڵبەستن نەک هەر بەزمانی پێغەمبەرەوە بەڵکو بەزمانی خوداشەوە

کتێبی گۆرین کە وەک گوتمان (٥٠) ساڵ زیاترە بەناو گەلی کوردی مسوڵمان دا بڵاوبۆتەوەو تاقە سەرچاوەی متمانە پێکراوی باس و خواسی ژیانی پێغەمبەرەکەیانە علیه الصلاة والسلام ، وەنەبێ هەر بەوەندە لێ گەڕابێ کە ڕیوایەت و درۆو دەلەسەی ناقۆڵاو لەگەڵ عەقڵ و شەرعدا نەگونجاو بەزمانی چوار جێنشینەکانی پێغەمبەرو زانایانی پایەبەرزو ناوداری ئیسلامەوە هەڵبەستێ ، بەڵکو لەوەش خراپتر نەک هەر بەزمانی پێغەمبەرەوە بەڵکو بەزمانی خوداشەوە درۆو دەلەسەو قسەی بێ کاکڵ و ناماقووڵی ڕێک خستوون .
بۆ وێنە لەلاپەڕە (٤٨) دا گوتوویەتی :

دخالت یا رسولی کلی عالەم . لەبۆتۆ خەلق کرا حوّا و آدم
بەحەقی آیەتی ( لولاک لولاک ) لەبۆتۆ داندراوە جملۀ أفلاک

وەک دەبینین ( لولاک لولاک لما خلقت الأفلاک )[1] کە

---

(١) تێبینی : هەڵبەتە ( لولاک لولاک ) سەربارەی ئەوەی کە

هێندێک کەسی نەزان و بێ ئاگا بە فەرموودەیەکی ( قدسي ) پێغەمبەری لەقەڵەم دەدەن ، خاوەنی کتێبی مەولوودنامــــە لەوەش واوەتر چووەو بە ( ئایەت ) ی قورئانیشی داناوە !!

---

( حدیث ) نیەو لەهیچ سەرچاوەیەکی بڕواپێکراودا نیــــە ، لەگەڵ عەقڵ و شەرعیش دا ناگونجێ ، چونکە :
١ـ بەئاشکرا فەرموویەتی ( وما خلقت الجن والأنس إلاّ لیعبدون) الذاریات / ٥٦ . واتە : جندو مرۆڤم بۆ هیچ دروســـــت نەکردوون مەگەر کە بمپەرستن .
جا مادام خودا ( جندو مرۆڤ ) کە بەشێکن لە بوونەوەر بۆکەس دروستی نەکردبن مەگەر بۆ پەرستنی خۆی ، هەمـــوو بوونەوەر حەوجار بۆکەس دروست نەکراوە .
( هەڵبەتە " محمد " یش صلی اللە علیە وسلم یەکێکە لەو مرۆڤانەی کە بۆ خواپەرستی دروست‌کراون ) !
٢ـ جگە لە پێغەمبەری ئێمە پێغەمبەرانی دیکەش هەبوون لـە ( أولوا العزم ) و غەیری وانیش ، جا هیچ ماقووڵ نیـــــە هەموو بوونەوەر بۆ یەکێک لە پێغەمبەران دروست‌بکـات ، بەڵام تەنانەت پووشکەیەک و کەستەکە گڵێکیش بۆ ئـــەو هەموو پێغەمبەرە پایەبەرزانەی دیکە دروست‌نەکات ، کـە ئەوانیش وەک وی پێغەمبەر بوون و لە پلەوپایەش دا ئیوایان هەیە چی وا لەبەر وی دا نیە ، هەرچەندە ئەو گــــەورەو سەروەری هەموانە .

تێبینی :
لەکتێبی ( تذکرة الموضوعات ) ی صنعاني و ، ( کشـــف الخفا ومزیل الالباس عما اشتهر من الاحادیث علی ألسنة الناس ) ی عجلوني ج٢ ص ٢١٤ ، ڕوون کراوەتەوە ، کــــە ( لولاک لولاک ) حدیث نیەو ( موضوع ) ە .

خاڵی حەوتەم : دەردی لەهەموو دەردان گرانتر

دەردی لەهەموو دەردان گرانتر ، لەکتێبی گۆرین دا ئەوەیە ، کە بەناو بۆئەوە نووسراوە کە لەیادی لەدایک بوونی پێغەمبەردا علیه الصلاة والسلام بخوێنرێتەوە ، وەک لەپێشەوەش گوتمان لەیادو بیرەوەری هەر ناودارێک دا پێویستە بیروباوەڕو ئاکارو ڕەفتارو ئامانجو مەبەستو ژیان و گوزەران و کەسایەتی ئەو ناودارە بخرێتەڕوو و باس بکرێ ، بۆئەوەی هەموو دەمێ لە بیروزەینی خەڵکیدا سازو ئامادە بێ و ، لەبیرنەچێتەوەو فەرامۆش نەکرێ .

بەڵام ئەو کتێبە کەمو زۆر باسی ئەو جۆرە مەسەلانە ناکاتو هەر لەدوورەوەش پەنجەیان بۆ درێژ ناکات !!

بەڵکو پێشەکی دێ چەند هەزار ساڵ بەرلەوەی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام لەدایک بێ ، چەندان دەریای قووڵ و بەرین و پەردەی تەنکو ئەستوور کە ڕایەڵ و تێوەدان ( تارو پۆ ) ەکەیان نەزانیو فەقیرحاڵییەتی ، لەکارگەی ئەفسانەچنی لاساکردنەوەی کوێرانەدا دەچنێو سازدەکاتو ، هەروا بەو جۆرە دەیهێنێ دەیهێنێ هەتا دەگاتەسەر کاتی تێدا لەدایک بوونی پێغەمبەر صلی الله علیه وآله وسلم ، ئنجا کاتێک لەدایک بوونی پێغەمبەر تەواو نیزیک دەبێتەوە جارێکی دیکەش تەشی خەیاڵ و بیری ئەفسانەیی دەخاتەکارو سەرگەرمی ڕستنی ڕیسێکی دیکە دەبێو ، لەئاکام دا لەو ڕیسە بەرگی ئەفسانەی ( دیوار شەق بوون ) و پەیدابوونی چوار ( مامان ) ان دەچنێ !!

سەرەنجام کتێبی گۆرین بە لەدایک بوونی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گلۆڵەی ڕیسی ئەفسانەچنینی لێدەبڕێو ،

بەمەش ئاهەنگی ( مولود ) کۆتایی پێ دێ و ، ئێستاش لە کوردستان دا وا باوە ، کە ئەو خەڵکەی کۆردەبەستن و بەناوی ( مولود ) خوێنرانەوەوە بانگ دەکرێن و دادەنیشن ، دەستبەجێ لەگەڵ مەلا گوتنی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام لەدایک بوو ! هەڵدەستنە پێو لەدوای مەلایەوە بەرەو قیبلە ڕیزدەبن و دەست بەرەو سەرێ بەرزدەکەنەوەو هەندێک دووعایان دەکەن و ، ئیدی ئاهەنگی ( مولود ) کۆتایی پێ دێ و ، دەست دەکرێ بە تەقەو ڕەقەو خرینگەو زرینگەی پەرداخ و پیاڵەو ئیستیکان و قاپ و کەوچک و دەبێتە هاشەو لووشەی خواردن و خواردنەوەو ، ئاوێ بێنەو دەستان بشۆ !!

جا تەماشاکەن و ڕامێنن و وردبنەوە !!

ژیانی هەموو ئینسانێک لەو ڕۆژەوە دەست پێ دەکات کە تێیدا لەدایک دەبێ و ، چاو بەدنیای ڕوون هەڵدێنێ ، ئەوە شتێکی ئاشکرایەو دەمبەدەمە هەڵناگرێ ، پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم ئینسانەو ، وەک هەموو ئینسانێک لەدایک بووەو پاش ژیانێکی (٦٣) ساڵەیی لەدنیا دەرچووە .

کەواتە کەسێک بیەوێ لە ژیانی پێغەمبەر حاڵی بێ و بزانێ کێ بووەو چۆن بووەو چی کردووەو چۆن ژیاوەو .. هتد دەبێ لە دووتوێ ی ئەو (٦٣) ساڵەدا بکەوێتە گەڕان و پشکنین و تێوەڕامان و سەرنج دان !!

جا توخوا دەبێ خەڵکێک هەموو شارەزاییەکەیان دەربارەی ژیانی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام لەچەند هەزار ساڵ پێش لەدایک بوونییەوە دەست پێ بکات و ، لەدەمی لەدایک بوونیدا کۆتایی پێ بێ ! دەبێ چۆن و چەند ئەو پێغەمبەرە

بناسێ که خۆی بەشوێن کەوتووی بەرنامەکەی و پابەنـــدی ڕێ و شوێنەکەی دەزانێ ؟!
جا خوێنەری بەڕێز !
بەڕاستی بەهەتا بیر لەکتێبی گۆرین دەکەمەوەو ، سەرنجی ئەو پەڕێزو شوێنەواره شووم و بێ خێره دەدەم کــه لەنێو گەلی کوردی مسوڵمان دا پەیدای کردوه ، مەگەر هەر خودا بزانێ چەندەم دڵ بەو خەڵکە بەدبەخت و چـــارەڕەش و بێ بەشە دەسووتێ ، کە گیرۆدەی کەسانێک بووە کە ئـــاوا باسی خوا و پێغەمبەرو علیه الصلاة والسلام ئیسلامەتـــی بۆدەکەن !
ئاخر پیێم نالێی چ گلەییو گازندەیەک لە بابایەکـــی نوێژنەکەرو لاڕێ و لامەزەب دەکەی کە هەموو شارەزاییەکەی دەربارەی پێغەمبەرو ڕابەرەکەی ئەوەیە ، کە چەند هـــەزار ساڵ بەرلە دایک بوونی لە فلان دەریادا و لەودیو فـــلان پەردەوە وای گوت و وای گوت و سەرەنجام لەفـــلان ڕۆژدا لەدایک بوو و هیچی دی ؟!
سەرباری ئەو هەموو ڕیوایەتە بێ بنچینەو بەسەرهاتـــە هەڵبەستراوانەو بیروبۆچوونە ئەفسانەییانەی کـــە وای لێ دەکەن ئەرک و فەرمانەکانی ئاین بە سفری پـــاش فاریزەو شتێکی زیاد تەماشا بکات و ، گوێ نەداتە هیـــچ شتێک و ئیمانێ بەنیسکێ بسپێرێ و ... هتد ؟!
بەڵێ بەڕاستی گەلێک ئاوا باسی پێغەمبەرەکەی خـــۆی بۆ دەکرێ و ، ئاوا ئیسلام و قورئان و سوننەتی لەبەرچـــاو دەبێزێنرێ شایستەی بەرۆش و بەزەیی پێداهاتنـــــــەوەو دڵ پێ سووتانە !!

کوڕە ئاخر وەڵڵا وەڵڵا فێڵ و پیلانێکی زۆر بێڕەزایە، بێنی بەناوی ( مولود ) خوێندنەوەوە یەک دوو سەعاتان درۆو دەلەسەو شتی پڕوپووچ بۆخەڵکی هەڵڕێژی هەتا دەگەیە سەر لەدایک بوونی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام، کە سەرەتاو دەست پێکردنی ژیانەکەیەتی، بەڵام یەکسەر کە گەیشتیە سەر جێی مەبەست و، کاتی ئەوەی هات شتێک دەربارەی ژیانی پێغەمبەر بخەیەڕوو کە خەڵک پێغەمبەرەکەیانی پێ بناسن و، سوودێکی لێ وەربگرن، دەست بەجێ وەک جندت بێنەسەرێو دەستت دەنە بن هەنگڵان هەستیەپێو، ڕای بگەیەنی کە :

بابە یادی لەدایک بوونی پێغەمبەرەکەتان تەواوبوو و سەرگوزشتەی ژیان و گوزەرانی بڕا !!

کوڕە براله !

تەواوبوونی چیو چی ؟! ژیانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەو جێیەڕا دەست پێ دەکات کە ئەتۆ لێی ڕاوەستاوی و پێت وایە ئەگەر شەقاوێکی دیکە هەڵێنی ماڵت کاول دەبێ !!

جا خوێنەری سەنگین !

قوڵە نەزیلەیەکی خۆمت بۆ دەگێڕمەوەو، دەست لە ڕەخنەگرتن و لەبێزینگ دان و سەرکوێزر لێگرتنی کتێبی گۆرین هەڵدەگرم :

برادەرێکم دەستنووسێکی بۆ ناردم کە بەحیساب تەرجەمەی کتێبێکی عارەبی بوو، بۆشی نووسیبووم کە هەندێک وردە هەڵەی زمانەوانی تێدان، زەحمەت نەبێ، بۆم ڕاست بکەوە!

که سەرنج دەدەمە دەستنووسی گۆرین هیچی بەسەر هیچەوە نیەو ئەگەر بۆخۆم لەنوێ دەقە عارەبیەکانی کتێبەکەم وەرگێڕابان زۆر ئاسانتربوو لە هەڵە ڕاستکردنەوەی وی ، منیش پاش ئەوەی لە هەڵە ڕاستکردنەوەی دەستنووسی گۆرین نائومێد بووم ، نامەیەکم بۆ خاوەنەکەی نووسی و ، پاش سەلام و ڕێزو هەواڵ پرسین ، ئامۆژگاریم کرد کە ئەو کتێبەی تۆ ملت بەبەرەوە ناوە زۆر گرانەو ، وای بەچاک دەزانم لە ئی ئاسانترەوە دەست پێ بکەی ، چونکە سەرەتاتە ، ئنجا بیرم کردەوە چ عوزرێک بێنمەوە کە هەڵەکانم بۆ ڕاست نەکردوونەوە ، هەرچەندی خۆم هێناو برد لەم ڕستەیەم ڕاستترو چاکتر نەدۆزی یەوە :

( کاکە گیان دەربارەی هەڵە ڕاستکردنەوەی دەستنووسەکەشت دەبێ ببووری ، چونکە : پووشکە لەکایە ناگیرێن ) .

جا لەکۆتایی سەرکوێرگرتنیش لە ( مەولوودنامە )ی گۆرین دا ، کە لەڕاستیدا بەس کتێبی پڵاوانە ، دەڵێم : پووشکە لەکایە ناگیرێن !!

## -٤-

## پێویستە چۆن یادی لەدایک بوونی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بکەینەوە ؟!

هەرچەندە پاش خوێندنەوەی ئەو باسانەی ڕابردن حەوجێ بە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەی سەرێ ناکات و ، وەڵامەکەی

لە دووتوێی باسەکانی پێشوودا خراوەتەڕوو ، بەڵام لەبەر زێدە گرنگی‌و بایەخێک کە هەیەتی ، حەزدەکەم لێرەش دا وەڵامێکی کورتی هەر بدەمەوە .

بێگومان قورئان تاقە کتێبی خودایە کە لە هەڵەو ناتەواوی تێکەوتن و ، گۆڕران و دەستکاری کران پارێزراوە ، وەک خودا فەرموویەتی : ( .. لایأتیە الباطل مِنْ بین یدیه ولا مِنْ خلفه .. ) فصلت / ٤٢ . واتە :

.. هەڵەو ناتەواوی نە لەپێشی‌یەوە وە نە لەدوایەوە ڕێی تێ نابا - و زەفەری پێ نابات - ..

بەڵێ قورئانی بەڕێز سەنگی مەحەک و تەرازووی ئیسلامەتی‌یە ، سوننەت و فەرموودە بەپێزەکانی پێغەمبەریش صلی اللە علیە وآلە وصحبە وسلم بەدەقی قورئان شەرح‌و لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی قورئانیان پێ سپێرراوە ، وەک خوای میهرەبان و کارساز فەرموویەتی : ( وأنزلنا إلیک الذکر لتبین للناس ما نُزِّل إلیهم ولعلهم یتفکرون ) النحل / ٤٤ . واتە : وە قورئانمان بۆلای تۆ ناردۆتەخوار ، تا ئەوەی بۆلای خەڵکی نێرراوەتەخوار - کە قورئانە - بۆیان ڕوون بکەیەوە ، بەشکم بیربکەنەوە .

بەڵێ پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام هەموو قسەو کرداروجموجۆڵ و چالاکی‌یەکی ژیانی (٢٣) ساڵەی پێغەمبەرایەتی ی بەپێی قورئان بوو و لە سوورگەی ( فلک ) ی وی دا دەهات و دەچوو ، وەک عائیشەی هاوسەری ، دایکی بڕواداران خوا لێی ڕازی بێ فەرموویەتی : ( کان خُلُقُه القرآن ) رواه أبوداود . واتە : ڕەوشتی وی قورئان بوو .

مادام وابێ هەرکەسێک بیەوێ وەک پێویست یادی لەدایک

بوونی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام بکاتەوەو ، بەخەڵکی بناسێنێ‌و ، خەت و ڕێبازو ڕێ و شوێن و خوو و خدەو ڕەوشت و ئاکارو ، سیاسەت و عیبادەت و ، تەقواو غەزاو وردو درشتیی لەخەڵکی بگەیەنێ ، حەتمەن دەبێ لەبەر تیشکی قورئان و سوننەتدا ئەو کارە ئەنجام بدات و ، هەڵبەتە بۆ جێبەجێ کردنی ئەو کارەو ڕوونکردنەوەی هەر مەسەلەیەکی دیکەش کە پەیوەندی بە ئیسلامەوە هەبێ ، ئینسان ئەگەر هەر مسوڵمانێکی سادەو عەوامیش بێ ، چ جای ئەوەی خۆی بەمیراتگرو جێ نشینی پێغەمبەریش بزانێ ، بۆی نیە جگە لەقورئان و سوننەت پرس بە هیچ سەرچاوەیەکی دیکە بکات ،[1] چونکە خودا فەرموویەتی :( وما اختلفتم فیه مِنْ شيْءٍ فحکمه إلیٰ الله .. ) الشوری / ١٠ ، واتە : وە لە هەرشتێکدا کێشەتان پەیدا بوو – و ڕاتان جیاجیا بوو– ئەوە بڕیارو حوکمی ئەو شتە عایدی خوایە ...

دەشتوانین بەکورتی چەند شێوەیەک وەک پێشنیار بخەینەڕوو بۆ چۆنیەتی یادکردنەوەی لەدایک بوونی پێغەمبەرمان صلی الله علیه وآله وصحبه وسلم :

یەکەم : دەگونجێ قۆناغ بەقۆناغ بەژیان و بەسەرهاتی پێغەمبەردا بچیەخوار ، هەتا کۆتایی ، بەڵام بەمەرجێک زۆر بەکورتی بەقۆناغی چل ساڵەیی پێش وەحی بۆهاتنیدا ڕەت بێ‌ت نەک وەک هەندێک کەس کە هەموو کاتەکە بەوەوە بەڕێ دەکا

(١) مەگەر لەوانەوە سەرچاوەی گرتبێ .

داخوا ( محمد ) صلى الله عليه وسلم كێ شيری داپەو چۆنی خواردو ، ( حەليمە ) چۆنی لەگەڵ خۆی بردو ، گوێ درێـژی حەليمە حاڵ و وەزعی چۆن بوو و .. هتد .

بەڵێ پێغەمبەر عليه الصلاة والسلام وەک ( محمد المصطفى )و رابەرو پێشەوا ، بۆ ئێمە جێی سەرنج لێدان و چاولێکردنیـە ، نەک وەک منداڵێکی شیرەخۆرەو .. هتد .

بێگومان مەبەستیشم لەوە نیە کە سەردەمی پێش بوونـــە پێغەمبەری پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم پشت گـــوێ بخرێ ، با ئەویش باس بکرێ ، بەڵام با هەر لایەنەی هەقـی خۆی بدرێتێو بەئەندازەی گرنگیو سوودلی وەرگیران خۆی پێوە خەریک بکرێ و کاتی پێ بەرێ بکرێ .

دووەم : وە دەشگونجێ بەهۆی باسکردن و روونکردنەوەی یەکێک لە لایەنەکانی ژيانی پێغەمبەر عليه الصلاة والســـــــلام ئاهەنگەکە بگێررێ ، وەک : خوو و رەوشتی پەسنـــــــدی ، سیاسەت و کارهەڵسوورانـدنی رەندی ، تەقواو خواپەرستـــی زۆرو زەوەندی ، سوارچاکیو جەنگاوەری ی ، ئازایەتـــی و خۆراگری ی ... (١) .

سێیەم : وە دەشێ وتارێکی گشتیو هەمەلایەنە ( حەوت دەرمانەیی) بدرێ ، کە تێیدا باسی گیروگرفت و نەخۆشی مسوڵمانـــان و کەمو کووری یەکانیان و ، رێ ی چارەسەر بکرێ .

چوارەم : وە رێ دەکەوێ خوێندنی چەند ئایەتێکی قورئـــان و تەفسیرکردنیان بەگوێرەی بارودۆخو پێویستی خەڵکەکە بکرێتە

---

(١) ( هەقی پێغەمبەر لەسەر ئوممەتەکەی ) کە پێشتر باسکرا یەکێکە لەو جۆرە وتارانە ، کە لەمانگی ( ربيع الأول ) یساڵی(١٤٠٩) لە ( خدراوا ) لەلایەن نووسەرەوە دراوە .

بابەتی ئەو یادکردنەوەو ئاهەنگ گێڕانە .

پێنجەم : دیسان زۆر شتێکی وێچوو و گونجاوە ، کە شینسان بچێتە نێو گوڵزاری فەرموودە بەپیت و پیرۆزەکانی پێغەمبەرەوەو صلی الله علیه وسلم ، چەپکێکیان لێ بچنێ و ، بەشێوەیەکی عاقڵانەو حەکیمانە مێشک و دڵی خەڵکەکە بەو عەترو گوڵاوە کە لەو چەپکە دەستگیری دەکات ، گوڵاوڕشێن و بۆنخۆش بکات .

ئەلێرەش دا کۆتایی بەم ( بەرکول ) ە دێنین و هیوادارم ژەنگی سەر زۆر دڵان و پەردەی بەر زۆر چاوان و لۆکەی نێو زۆر گوێ یانی پێ لاچێ ، کەسێکیش کە بەپێی یاسای کۆن و هەڵەی ( إنا وجدنا آباءنا علی أُمة وإنّا علی آثارهم مهتدون )(۱) دڵی بەم قسانە دێشێ و خۆی پۆزدەکاو قسان دەپرژێنێ ، پێشەکی داوای لێبوردنی لێ دەکەم و ، دوایش حەوالەی خوای دەکەم و ، داوای چاک بوونەوەو دڵ ساڕێژبوونی بۆدەکەم ، ئەگەر پێشی وابێ شتێکی هەڵەو ناڕەوام گوتوە زۆر سوپاسیشی دەکەم کە بەخێراخۆی پێم ڕابگەیەنێ ، چونکە ( هەر یەکە کە بەسەهوو ناچێ ) ؛



---

(۱) سورة الزخرف / ۲۲ .

# دواقسەم

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست !

لەکۆتایی ئەم ئاڵقەیەدا دەمەوێ دوا قسەی خۆمت لەچەند خاڵێکدا ئاراستە بکەم :

١- وەک لەرابردوودا گوتمان گەورەترین حیکمەتی خـــــوای کاربەجێ لە ناردنی پێغەمبەران دا علیهم الصلاة والسلام ئەوەبووە کە خەڵکی بەڵگەو بیانوویان بەدەستەوە نەمێنێ و، ڕێگای گلەیی و گازندەیان نەمێنێ : ( رسلا مبشرین ومنذرین لئلا یکون للناس علی الله حجة بعد الرسل .. ) النساء /١٦٥.

کەواتە بێگومان دوای هاتنی پێغەمبەران و بەتایبەتـی دوایین پێغەمبەرو چاکترین پێشەواو سەروەری مرۆڤایەتـی بەهیچ شێوەیەک هیچ کەسێک بەڵگەو بیانووی لەخـــوا دوورکەوتنەوەو گرتنی ڕێچکەی چەوت و هەڵەی بەدەستـــەوە نەماوە ، چونکە شێتی و نەفامییە ئینسان واز لە ڕووناکـی خۆر بێنێ و لەپشتیرو بنەبانێکی تاریک و تەڵەم دا بەدیار چرا ڕەشکەیەکی نابووتەوە دابنیشێ !!

دیارە ئێستاش هەرچەندە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام بەشەخسی خۆیان لەنێو مرۆڤایەتیدا نەماون ، بەڵام بەفیکرو ڕێ و شوێن و بەرنامەو پەیرەو - کە لەئیسلامدا خـــۆی دەنوێنێ و ئەویش لەئاوێنەی زاناو میراتگرو جێگرانـــی ڕەسەن و ڕاستەقینەی پێغەمبەران دا دەدرەوشێتەوە - هـــەر ماون و خەت و ڕێبازەکەیان بەردەوام لەئارادایەو درێژەی پێ دەدرێ .

٢- جۆرو شێوەی ژیانی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام وا هەڵکەوتوە کە هیچ کەس ڕێگای بەهانەهێنانەوەو منجەمنجی نەبێ ، چونکە :

ئەگەر کابرا بیانووی ئەوەبێ کە لەمێژە خەریکی بانگەوازو خەباتەو هیچی بۆبەهیچ نەکراوە ، تەمەنی دوورو درێژو کەمبەرهەمی ( نووح ) علیه الصلاة والسلام قسەی دەبڕێ :( ولقد أرسلنا نوحا إلى قومه فلبث فيهم ألف سنة إلاّ خمسين عاما .. ) العنكبوت / ١٤ !

وە ئەگەر بڵێ لەبەر نەساغیو دەردەداری پەکم کەوتوەو خوام بۆ ناپەرسترێ و ئاییینم بۆ ڕەنێو نایەت ، ژیانی پرئێش و ژان و ناسۆری ( ئەییوب ) علیه الصلاة والسلام لەسەری دەبێتە بەڵگە !

وە ئەگەر عوزری نەداری و تەنگدەستی بێ ( عیسی ) علیه الصلاة والسلام کە پێشەوای دنیا بەکەمگران بووە لەسەری دەبێتە شایەد کە بابای هەژاریش دەتوانێ خواپەرست و پابەند ( مُلتَزم ) بێت !

وە ئەگەر بێجێو ڕێ بی و دەربەدەری بەبەهانە بێنێتەوە ( إبراهيم ) علیه الصلاة والسلام کە هەرجارە بۆ وڵاتێک کۆچی کردوەو دەربەدەربووە قسەی پێ نایەڵێ ، چونکە ئەو پایەبەرزە لەگەڵ ئەو حاڵەشیدا گەورەترین بانگەوازو خەباتی کرد !

وە ئەگەر دەسەڵاتو سامان بکاتە بیانووی خۆی ، ( داوود و سلیمان ) علیهما الصلاة والسلام کە وێرای پێغەمبەرایەتی پادشا ( مَلِكْ ) یش بوون ، بە بەڵگەی ژیانی خۆیان پێی دەسەلمێنن کە خواناسیو دینداری لەگەڵ دەسەڵات و

سامان دا دژایەتی نیەو ، ئینسان دەتوانێ وێڕای سامانداریو دەستەڵاتداری خوداش بپەرستێ و دەستەڵات و [1] سامانەکەشی بکاتە وەسیلەی خزمەتی ئاینیەکەی !!

٣ـ کەواتە با ئێمەی مسوڵمان و خۆبەشوێن کەوتووی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام ، هەوڵ بدەین کە هەرچی زیاترو چاکتر لەژیان و بەسەرهاتی ئەو زاتە بەرزانە بگەیـن و وردبینەوەو ، گەوهەرو مرواری بەکانی دەریای قووڵـی ژیان و گوزەرانیان دەربێنین و ، بەچاوی عەقڵ و دڵ لەفەرموودەو هەڵوێستەکانیان وردبینەوەو ڕامێنین ، تاکـو بتوانین لەبەرتیشک و ڕووناکی مەشخەڵی هیدایەتی یـان دا بەڕێوەبچین و ئەم ئامۆژگاری یە بەرزەی خواوەند لەدڵ بگرین ، کە دەربارەی کۆمەڵێک لەو زاتانە بەپێغەمبەرمان دەفەرموێ : ( أولئک الذین هدى الله فبهداهم اقتده..) الأنعام - ٩٠ -

بەڵێ ئینسانی ژیرو فامیدە تەنیا متمانە بەو رابـەرو چاوساغانە دەکات و ، بەس خۆی تەسلیمی خەت و ڕێبازی ئـەو سەرکردەو پێشەوایانە دەکات کە خوا پاکانە ( تزکیة )یان دەکات و ، شایەدی ڕێ دیتنەوەو سەرراستی یان بۆدەدات ، کە پێغەمبەرانی پایەبەرزن علیهم الصلاة والسلام و ئەو زانـا جێگرە ڕەسەنانەن کە بەڕاستی دڵبەندو ئاڵقەلەگوێو شوێـن کەوتووی مووبەمووی ئەو زاتە بێ وێنانەن .

ئیدی بەئومێدی زیاتر حاڵی بوون لە بانگـەوازی پێغەمبەران و چاکتر پابەندی ی بەخەت و ڕێبازیانەوە .

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

ذوالحجة ١٤١٠ ک / ٢٢ حزيران ١٩٩٠ ز/ خدراوا

---

(١) دیارە مەبەست دەستەڵات و سامانێکە کە بەڕێیەکی شەرعی ی وەدەست هێنرابێ .

# ناوەڕۆکی باسەکان

| لاپەڕە | بابەت |
| --- | --- |





لە بڵاوکراوەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق دا

چاپخانەی شەهیدان

# ئەم زنجیرەیە

بەمەبەستی ئەوە نووسراوە کە ببێتە مەشخەڵێک بۆ تێگەیاندن و پێگەیاندن و فێرکردن و پەروەردەکردنی کۆمەڵە مسوڵمانێکی پێشەنگی هەڵبژاردە ، کە بتوانن بەرنامەی خواو ڕێ و شوێنی پێغەمبەری پێشەوا صلی اللە علیە وآلە وسلم ببووژێننەوە ، وە گەلی ماڵ وێران و بێ شوانیان لەژێر نیری ستەم و چەوساندنەوەو لەگێژاوی بێ قەوارەیی قوتار بکەن و ، لەبن سێبەری ئیسلام دا بیحەسێننەوە ، بەمەش گەورەترین ئامانجی ژیانی دنیا وەدەست بێنن کە بریتیە لە ڕەزامەندی خوا جل جلالە .



نرخی ٤٠٠٠ دینارە

لە بڵاوکراوەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق دا

چاپخانەی شەهیدان